عفان (٤٧ پ.ک. تا ٣٥ ک.) و علي بن أبي طالب (٢٣ پ. ک. تا ٤٠ ک.) و معاوية بن سفيان (١٥ پ.ک. تا ٦٠ ک.) وه جگه ئەوانیش له هاوەڵان (علیهم رضوان الله تعالی)، هەمووشیان بە گومان و لێکدانەوەی بەتاڵ و مەنهەجێکی فاسد ئەم تەکفیرەیان دەکرد، کەچی وێڕای ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەبێ ئەوەی گومان و لێکدانەوەکەیان بکاتە پۆزشت دەربارەیان دەفەرموێت:

١) (يمروقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية)، واتە: (دەردەچن لە دین هەروەک چۆن بەخێرایی تیر لە کەوان دەردەچێ).

٢) وە دەفەرموێت: (لئن أنا أدركناهم لأقتلنهم قتل عاد)، واتە: (ئەگەر من پێیان بگەم ئەوا لەگەڵیان دەجەنگم و کوشتاریان دەکەم وەک کوشتاری گەلی عاد).

سەبارەت بە فەرموودەی یەکەم، دوو وتە هەیە دەربارەی، لە ناو هاوەڵان (علیهم رضوان الله)، ئەویش:

١) پێشەوا علي (٢٣ پ. ک. تا ٤٠ ک.) (رضي الله عنه) دەفەرموێت: (کافر نەبوون بەڵکوو زیادەڕەوییان کرد).

٢) پێشەوا أبو أمامة الباهلي (و. ٨١ ک. یان ٨٦ ک.) (رضي الله عنه) دەفەرموێت: (کافر بوون پاش ئیمانەکەیان).

لێرەدا تێبینیەک هەیە ئەویش ئەوەیە پێشەوا علي (رضي الله عنه) بە پێشەوا أبو أمامة الباهلي ی نەفەرموو: (تەکفیریی)!، وە پێشەوا أبو أمامة الباهلي (رضي الله عنه) تەکفیری پێشەوا علي نەکرد، جا بزانە ڕەحمەتو لێوێ ئەم جۆرە کافرکردنە لە جۆری ڕا جوداییە (مختلف فيه).

---

لەسەریان بە ڕاست و ڕەوا دەزانن، گەر ستەم و تاوانیان کرد با کوفریشیان نەکردبێ!، وە تەکفیری پێشەوا (عثمان و علي)یان دەکرد، وە هەروەها هاوەڵەکانی تریش (الله لێیان ڕازبێت).

چوارەم: (لا عذر للمشرك بالتقليد)، واتە: (پۆزشت نییە بۆ کەسێک کە لەناو کوفر و شیرکدا بێت بەبیانووی چاولێکردن و شوێنکەتنی کوێرانە).

١) خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرموێت: (بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِمْ مُهْتَدُونَ ۞ وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِمْ مُقْتَدُونَ)[٣٨]. واتە: (کاتێک بانگەوازی گۆڕ پەرستان و پیاوچاک پەرستان و ئەهلی شیرک کرا بۆ تەوحید و یەکخواپەرستی، وتیان: (بەڵکو ئێمە لە باوباپیرانمانەوە دین و ڕێبازمان بۆ بەجێماوە، ئێمە بەوە هیدایەت دراوین) ۞ وە بەهەمان شێوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێک و ئاگادارکەرەوەیەکمان نەناردووە مەگەر گەورەکانیان و دەم ڕۆشتووەکانیان وتوویانە: (ئێمە دین و ڕێبازی باوباپیرانمان دەست کەوتووە وە شوێن هەنگاوی ئەوان دەکەوین)).

٢) خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرموێت: (وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا)[٣٩]. واتە: (دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئێمە گوێڕایەڵ و شوێن سەرکردەکان و زانا خراپەکانمان کەوتین و گومڕایان کردین لە ڕێگای ڕاست).

دەچینە خزمەت ڕاڤەی إبن كثير الديمشقي (٧٠١ ک. تا ٧٧٤ ک.)، کە لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (سَادَتَنَا) واتە: سەرکردەکان، وە (وَكُبَرَاءَنَا) واتە: زاناکان).

خوای پەروەردگار نەیفەرموو مادام نەزان و نەفام بوون و شوێن ئەوان کەوتون لێتان خۆشدەبم!، بەڵکوو لەگەڵ ئەواندا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات.

---

(٣٨) الزخرف : ٢٢ و ٢٣.
(٣٩) الأحزاب : ٦٧.

٣) خوای رب العالمین (ﷻ) بەوانەی کە گاڵتەیان کرد بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان (رضي الله عنهم) ئەفەرموێ: (لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ)[٤٠]. ئەوانە پۆزشتەکەیان قبووڵ نەبوو!، چونکە بەرامبەر پێغەمبەری الله بوو کردارەکەیان، گاڵتەیان کرد، گاڵتەکردنیش کوفرە، با مەبەستی کوفریشیان نەبووبێ.

٤) پێشوا أبو بکر الصدیق (٥٠ پ.ک. تا ١٣ ک.) (ﷺ) تەکفیری هەموو ئەوانەی کرد کە ڕێگری زەکاتیان کرد، کافری کردن و جیهادی کرد بەرامبەریان و حوکمی هەڵگەڕاوە و کافری دا بەسەریاندا.

وە لەسەردەمی پێشەوا عمر (٤٠ پ.ک. تا ٢٣ ک.) (ﷺ) کۆدەنگی هەموو هاوەڵان دروست بوو لەسەر تەکفیری (قدامة بن مظعون (٣٢ پ.ک. تا ٣٦ ک.)) ئەگەر تەوبەی نەکردایە، لە کاتێکدا بە گومان و لێکدانەوە کەوتبووە ناو کوفری بە حەڵاڵ زانینی ئارەق خواردنەوە.

وە پێشەوا علي یش (٢٣ پ. ک. تا ٤٠ ک.) (ﷺ) تەکفیری ئەوانەی کرد کە زیادەڕەوییان کرد لە پێگە و جێگەی پێشەوای باوەڕداران، کاتێک بە پێشەوایان وت: (خوا) پەنا دەگرین بە خوای پەروەردگار (ﷻ).

---

(٤٠) التوبە : ٦.

## دەروازەی سێیەم:

## بۆچونی چوار ڕێبازەکە لەسەر پرسی پۆزشت بە نەزانین

### ١/ حەنەفییەکان:

١) ملا علي القارئ الحنفي (و. ١٠١٤ ک.) وتەی خاوەن پەرتووکی [منهاج المصلين] دەگوازێتەوە کە پێشەوایەکی گەورەی حەنەفییەکانە و دەڵێت: (إن الجاهل إذا تكلم بكلمة الكفر، ولم يدر أنها كفر قال بعضهم: لا يكون كفرا ويعذر بالجهل، وقال بعضهم يصير كافرا، ومنها أنه أتى بلفظة الكفر وهو يعلم أنها كفر إلا إن أتى بها على اختار فيكفر عند عآمة العلماء خلافا للبعض، ولا يعذر بالجهل)[٤١]، واتە: (بێگومان ئەگەر کەسێکی نەزان، وشەیەکی کوفریی بڵێت و نەزانێت کە ئەوە کوفرە، هەندێک وتوویانە: کافر نابێت و پۆزشت بە نەزانینی بۆ هەیە و بۆی دەهێننەوە، وە ئەوانی تر وتوویانە: پێی کافر دەبێت، گەر کەسێک وشەیەکی کوفری بڵێت و نەزانێت کوفرە بە مەرجێک بە ویستی خۆی وتبێتی، ئەوا کافر دەبێت لای زانایان بەگشتی، بە پێچەوانەی هەندێکەوە، وە پۆزشت بە نەزانینی بۆ ناهێننەوە).

٢) خاوەنی پەرتووکی [درر البحار] (بەڕەحمەت بێت) کە حەنەفییە دەڵێت: (وإن لم يعتقد أن يعلم أنها لفظة الكفر، ولكن أتى بها على اختيار فقد كفر عند عآمة العلماء ولا يعذر بالجهل)[٤٢]، واتە: (ئەگەر بیروباوەڕیشی پێی نەبێت یان نەشزانێت کە ئەوە کوفرە، بەڵام بە ویستی خۆی کوفرەکە بکات، ئەوا کافر دەبێت لای زانایان بەگشتی و پۆزشت بە نەزانینی بۆ ناهێنرێتەوە).

---

(٤١) الفقه الأكبر - لاپەڕە: ٢٩٢.

(٤٢) مجمع الأنهار شرح ملتقى الأبحر - لاپەڕە: ٦٩٦.

## ٢/ مالیكییەكان:

١) القرافي المالكي (٦٢٦ ك. تا ٦٨٤ ك.) دەڵێت: (ولذلك لم يعذره الله بالجهل في أصول الدين إجماعا)[٤٣]، واتە: (لەبەر ئەوەیە كە خوای رب العالمین (ﷻ) نەزانینی دانەناوە بە پۆزشت لە بیروباوەڕدا[٤٤] ئەمە كۆدەنگی زانایانە).

٢) قاضي العياض (٤٧٦ ك. تا ٥٤٤ ك.) كە زانایەكی گەورەی مالیكییەكانە دەڵێت: (لا يعذر أحد في الكفر بالجهالة، ولا بدعوى ذلل اللسان، ولا بشيء مما ذكرناه إذا كان عقله في فطرته سليمة، إلا أكره وقلبه مطمئن بالإيمان، وبهذا أفتى الأندلسيون)[٤٥]، واتە: (پۆزشت بۆ كەس ناهێنرێتەوە لە كوفردا بە نەزانین، وە بە بیانوی خلیسكانی زوبان، وە بە هیچ شتێک لەوانەی باسمان كرد، ئەگەر كەسەكە ئەقڵی لە دروست بوونیەوە تەواو بوو‌بێت[٤٦]، تەنها كەسێک نەبێت كە بە زۆر كوفری پێ كرابێت و دڵیشی پڕبێ و سەقامگیربێ لەسەر باوەڕ، هەر بەمە هەموو زانایانی ئەندەلووس فەتوایان داوە).

٣) محمد بن عرفة المالكي (و. ١٢٣٠ ك.) كە ناسراوە بە (الدسوقي) لە حاشییەكەیدا بەسەر [الشرح الكبير] لە باسی هەڵگەڕانەوە و ڕۆشنكەرەوەی ئەوەی كە نەزانین نابێتە پۆزشت، دەڵێت: (قوله (أو شك في

---

(٤٣) الفروق - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ١٤٩.

(٤٤) بزانە ڕەحمەتو لێوێ لە بابەتە ئاشكراكاندا پۆزشت نییە بە نەزانین، نەک بابەتە شاراوەكان!، با بابەتە شاراوەكانیش لە بیروباوەڕ بێت.

(٤٥) شرح الشفاء لعلي القاريء - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ٤٣٨.

(٤٦) واتە شێت یاخود بێ ئەقڵ نەبێت، چونكە گەر كەسەكە شێت یاخود بێ ئەقڵ بێت ئەوە شێتییەكەی ڕێگر دەبێت لە كافركردنی.

موسڵمانانی بەڕێز، بۆ ئاشنا بوون بە بابەتی كافركردن (التكفير) بڕوانە نامیلكەی [كافركردن و جۆرەكانی مەرجەكان و ڕێگرییەكان و بنەماكانی - التكفير وأنواعه شروط وموانع وقواعده]، كە سوپاس بۆ خوای پەروەردگار لە دانراوی خۆمانە و لە ماوەی ڕابردوودا نوسیومانە، هەر برایەک ئەیەوێت ئاشنای ببێت، با ئاگادارمان بكاتەوە، والله أعلم بالصواب.

ذلك) أي سواء كان ممن يظن به العلم أو لا، لأن الحق أنه لا يعذر في موجبات الكفر بالجهل، كما صرح به أبو الحسن المالكي في شرح رسالة محمد بن أبي زيد القيرواني)[٤٧]، واته: (وتەکەی[٤٨] (یان گومانی هەبێ لە شتێکی بیروباوەڕدا) واتە یەکسانە ئەوەی وا گومانی عیلمی پێ ببرێت یان نا، چونکە ڕاستیی ئەوەیە کە پۆزشت بە نەزانین ناهێنرێتەوە بۆ شتێک کە موسڵمان کافر بکات، هەروەک ئەبو لحەسەنی مالیکی لە شەرحەکەیدا بەسەر پەیامەکەی موحەممەدی کوڕی ئەبی زەیدی قەیرەوانی (٣١٠ ک. تا ٣٨٦ ک.) بە ڕاشکاوی باسی کردووە).

## ٣/ شافعییەکان:

١) باوکی عبداللە محمدی کوڕی ئیدریس ئەششافیعی (١٥٠ ک. تا ٢٠٤ ک.) دەڵێت: (لو عذر الجاهل لأجل الجهله لكان الجهل خيرا من العلم، إذ كان يحط عن العبد أعباد التكليف ويريح قلبه من ضروب التعنيف، فلا حجة للعبد في جهله بالحكم بعد التبليغ والتمكن (رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ)[٤٩][٥٠]. واتە: (ئەگەر نەزان پۆزشتی بۆ بهێنرێتەوە بە هۆی نەزانینەکەیەوە، ئەوکات نەزانین زۆر باشتربوو لە زانست و زانین، چونکە ئەوکاتە بارەکانی سەپاندن لەسەر شانی بەندە لادەچوو، وە دڵەکەی ئاسودە دەبوو لە بەشەکانی ناڕەحەتی، هیچ بیانوویەک نییە بۆ بەندە بە نەزانین بەوەی حوکم نەدرێت لە دوای گەیشتنی دین پێی و توانینی فێربوونی، (خوای تعالی پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردووە کە گەلەکانیان هیچ بیانوویەکیان نەمێنێت لای خوای رب العالمين لە دوای ناردنی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام)).

(٤٧) حاشية الدسوقي على الشرح الكبير في فقه المالكية - بەرگی: ٤ - لاپەڕە: ٣٠٢.
(٤٨) واتە وتەی خاوەن پەرتووکەکە.
(٤٩) النساء : ١٦٥.
(٥٠) المنثور في القواعد الفقهية للزركشي - بەرگی: ٢ - لاپەڕەکانی: ١٥ - ١٧.

### ٤/ حەنبەلییەکان:

١) ابن القيم الجوزي الحنبلي (٦٩١ ک. تا ٧٥١ ک.) لە دوای ئەوەی باسی ئەوە دەکات ئیسلام و موسڵمانێتی بە تەوحیدەوە بەندە و بریتییە لەوەی کە باوەڕێکی تەواو بە تەنهایی خوای تعالی بهێنیت و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەیت، دەفەرموێت: (فما لم يأت العبد بهذا فليس بمسلم، وإن لم يكن كافرا معاندا فهو كافر جاهل)[٥١]، واتە: (ئەوەی بەمەوە نەیەت و ئەم تەوحید و باوەڕەی پێ نەبێت ئەوە موسڵمان نییە، جا ئەگەر کافرێکی کەللە ڕەق نەبێت ئەوا کافرێکی نەزانە).

وە لە شوێنێکی تردا دەڵێت: (فإنما حجة الله قد قامت على العباد بإرسال الرسل وإنزال الكتب وبلوغ ذلك إليه وتمكُنِهِ من العلم به سواء عَلِمَ أم جَهِلَ، فكل من تمكَنَ من معرفة ما أمر الله به ونهى الله عنه فَقَصَرَ عنه ولم يعرفهُ فقد قامت عليه الحجة)[٥٢]، واتە: (بەڵگەی خوای تعالی هاتۆتە دی بەسەر بەندەکانەوە ئەوە بە ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبەکان و گەشتنی بەو کەسە و توانیبێتی فێربێت، جا ئیتر بزانێت یان نەزانێت، هەرکەس بتوانێ ئەوەی کە خوای تعالی فەرمانی پێ کردووە و ڕێگری لێکردووە، کەم تەرخەمبێت و فێرنەبێت، ئەوە بەڵگەی لەسەر بەرپا بووە).

کەواتە لە وتەی ابن القيم (٦٩١ ک. تا ٧٥١ ک.) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت: هەرکەسێک بتوانێت بگەڕێت بە دوای زانستدا، بەڵام نەچێت و نەگەڕێت، ئەوا ئەوە بۆی نابێتە پۆزشت.

کەواتە جگە (جهل الإعراض) کە هەڵوەشێنەرەوەیەکی ئیسلامە لە هەڵوەشێنەرەوەکان، نەزانینێکی ترمان هەیە کە بریتییە لە (جهل التفريط) کە نەزانینێکە بەهۆی کەم تەرخەمیەوە دەبێت، ئەمەش نابێتە پۆزشت بۆ خاوەنەکەی.

---

(٥١) طريق الهجرتين - لاپەڕە: ٣٨٢.
(٥٢) مدارج السالكين - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٢١٧.

## دەروازەی چوارەم:

## باقی وتەی زانایان

١) ابن تیمیه ‹٦٦١ ک. تا ٧٢٨ ک.› لە (مسائل الخفیة و الظاهرة)دا جیاوازی کردووە، گەر کەسێک کوفری لێ بینرا لە بابەتە شاراوەکان، حوکم نادرێت بەسەریدا، تاکو بەڵگەی لەسەر بەرپا نەکرێت، کە پێگەشتنی بەڵگەی قورئان یان فەرموودەیە بە کەسەکە، بە زوبانی خۆی یان زوبانێک ئەو لێی تێبگات، دوای بەرپاکردنی بەڵگە گەر کەسەکە لاسار و کەڵلە ڕەق[٥٣] بوو ئەوا حوکم دەدرێت بەسەریدا، وە لەبابەتە ئاشکراکاندا پۆزشتی بۆ نەزان قبووڵ نەکردووە، بەوەی پێی نەوترێ موشریک[٥٤].

٢) عبدالله أبا بطین ‹و. ١٢٨٢ ک.› دەڵێت: (قد أجمع المسلمون على كفر من لم يكفر الهيود والنصارى أو شك في كفرهم ونحن نتقين أن أكثرهم جُهال)[٥٥]، واتە: ‹کۆدەنگی موسڵمانان هەیە لەسەر کوفری کەسێک کە جوولەکە و گاورەکان بە کافر نازانێت، یان گومانی هەیە لە کافرکردنیان، ئێمە دڵنیاین کە زۆرینەیان نەزان ونەفامن›.

٣) عبدالله أبا بطین ‹و. ١٢٨٢ ک.› دەڵێت: (فالمدعي أن مرتكب الكفر متأولاً أو مجتهداً أو مخطئاً أو مقليداً أو جاهلاً معذور مخالف للكتاب والسنة والإجماع بلا شك مع أنه لا بُد أن ينقَضَ أصلَهُ كفر بلا ريب، كما لو توقف في تكفير مع شك في رسالة محمد (ﷺ) ونحو ذلك)[٥٦]، واتە: ‹هەر کەسێک بڵێت هەڵگری کوفر،

---

(٥٣) عناد واتە: ‹کەڵلە ڕەق ، لاسار ، منجڕ›، بڕوانە: [فەرهەنگی نۆبەرە - گیو موکریانی - لاپەڕە: ٢٧٠].
(٥٤) الدرر السنیه - بەرگی: ١٠ - لاپەڕە: ٣٣٥.
(٥٥) الدرر السنة - بەرگی: ١٠ - لاپەڕە: ٦٩.
(٥٦) الدرر السنية - بەرگی: ١٢ لاپەڕە: ٧٢ - ٧٣ وە لە مجموعة الرسائل بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٦٥٩.

**جا بە لێکدانەوە یان کۆششکردن یان بە هەڵە یان لاسایی کردنەوە یان نەزانین ئەمانە پۆزشتیان هەیە، ئەوە بەڕاستی پێچەوانەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگییە بەبێ هیچ گومانێک. لەگەڵ ئەوەشدا (إلا[٥٧]) بنەڕەتەکەی و بناغەکەی هەڵدەوەشێتەوە، جا کاتێ بنەڕەتەکەی هەڵوەشاندەوە ئەوە هەر بێ هیچ گومانێک کافرە، یان بوەستێت لە کافرکردنی ئەو کەسەی کە گومانی لە (رسالة[٥٨])ی پێغەمبەر (ﷺ) هەبێت وە هاوشێوەی ئەوانە).**

٤) **أبا بطين** (و. ١٢٨٢ ک.) دەڵێت: (فكيف يقول هذا: (أي: الذي يعذر بالجهل في نواقض التوحيد) في من يَشَكُ في وجود الرب سبحابه وتعالى أو في وحدانيتِهِ أو يَشَكُ في نُبُوَةِ محمد (ﷺ) أو في البعث بعد الموت، فإن طرد أصله في ذلك فهو كافر بلا شك، كما قَررهُ موفق الدين ابن قُدامة في كلامِهِ، وإن لم يطرد أصله في ذلك، فلم لا يعذر بالشك في هذه الأشياء وعذر فاعل الشرك الأكبر المناقض لشهادة أن لا إله إلا الله، التي في أصل الدين الإسلام بجهلِهِ فهذا تناقض ظاهر)[٥٩]، واتە: **(چۆن دەڵێیت: نەزانین پۆزشتە لەو شتانەی تەوحید هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەوە لەو کەسەی کە گومانی هەبێ لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) و پەیامەکەی یان گومانی هەبێت لە ڕۆژی زیندووبوونەوە لەپاش مردنی، ئەگەر بنەڕەتەکەی کە تەوحیدە هەڵبوەشێتەوە لەسەر ئەم شتانە ئەوا کافرە بەبێ هیچ گومانێک، هەر وەک ابن قدامە (٥٤١ ک. تا ٦٢٠ ک.) لە وتەکانیدا دانی پێدا ناوە. ئەگەر وا گومان ببەیت کە بنەڕەتەکەی هەڵنەوەشاندووەتەوە لەم شتانە، ئەوە بەبێ هیچ گومانێک نەزانین پۆزشت نییە لەو شتانە. پۆزشت بۆ بکەری شیرکی گەورە کە هەڵوەشێنەرەوەی گەواهی "لا إله إلا الله"یە، کە هەر ئەویشە بناغەی دینی**

---

(٥٧) إلا واتە: (مەگەر ، بێجگە ، هێلە ، بەدەر لە)، بڕوانە: [(فەرهەنگی نۆبەرە - گیو موکریانی - لاپەڕە: ٣٥) و [فەرهەنگی دەریا - م. ڕزگار کەریم - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٣٩)].

(٥٨) رسالة واتە: (پەیام ، نامە)، بڕوانە: [فەرهەنگی دەریا - ڕزگار کەریم - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٣٢٣].

(٥٩) الدرر السنية - بەرگی: ١٠ - لاپەڕە: ٣٥٩.

ئیسلام، جا نەزانین پۆزشت بێت تێیدا! ئەوە بەڕاستی پێچەوانەی ڕووکەش و ڕووکاری تەوحیدە).

٥) أبا بطين (و. ١٢٨٢ ک.) دەڵێت: (وأرسل الله جميع الرسل يدعون إلى التوحيد ومعرفة ضده، وهو الشرك الذي لا يغفر، ولا عذر للمكلف في الجهل)[٦٠]، واتە: (خوای رب العالمین (ﷻ) هەموو پێغەمبەرانی (عليهم الصلاة والسلام) نارد بۆ ئەوەی بانگەشەی تەوحید بکەن و دژەکەی بە خەڵکی بناسێنن کە هاوەڵ بۆ ﷲ بڕیاردانە، کە ئەم هاوەڵ بڕیاردانە خوای رب العالمین (ﷻ) هەرگیز لێی خۆش نابێت (گەر مرد و داوای لێخۆشبوونی نەکردبوو). وە هیچ پۆزشتێک نییە بۆ کەسێکی بەرپرسیار[٦١] کە باڵغ بووە، بە نەزانین بە ئەو شتانە).

وە دەڵێت: (وأول شيء يبدأ به العلماء في باب حكم المرتد الشرك، يقولون: من أشرك بالله كَفَرَ، لإن الشرك عندهم أعظم أنواع الكفر، ولم يقولوا: إن كان مثله لا يجهله)، واتە: (یەکەم شت کە زانایان لە باسی حوکمی هەڵگەڕاوە دەستیان پێ کردبێت شیرکە، کە دەفەرموون: (هەرکەس شیرک بۆ خوای پەروەردگار (ﷻ) ئەنجام بدات ئەوە کوفری کردووە، لەبەر ئەوەی شیرک لای ئەوان لە گەورەترینی جۆرەکانی کوفرە، هیچ کەسێکیان نەیان وتووە: (بە مەرجێک جەهلی هەبێت)).

٦) إسحاق آل الشيخ (١٢٧٦ ک. تا ١٣١٩ ک.) دەڵێت: (یەکێ لەو (بدعة[٦٢]) نوێیانەی سەری هەڵداوە ئەوەیە کە: جیاوازی دەکەن لە نێوان وتە و خاوەنی وتە لە شیرکی گەورەدا، هەموو ئەم شتانەم لە نامەیەم نەقڵ کردووە، لەم سەردەمەی ئێمە کۆمەڵێک لە خەڵکی ئیحسا تاقی کراونەتەوە بەوەی ئایا پۆزشت هەیە بە نەزانین؟، وە ئەو وتەیەش دەخەنە پاڵ شێخ موحەممەدی

(٦٠) الإنتصار لحزب الله الموحدين والرد على المجادل عن المشركين - لاپەڕە: ١١.
(٦١) بەرپرسیار واتە: (مكلف)، بڕوانە: [فەرهەنگی دەیا- ڕزگار کەریم - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ٤٩٥].
(٦٢) بدعة وایە: (تازە پەیدابوو ، داهێنان)، بڕوانە: [(فەرهەنگی نۆبەرە - گیو موکریانی - لاپەڕە: ٥٦) و (فەرهەنگی دەریا - م. ڕزگار کەریم - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٦٢)].

کوڕی عبدالوهاب، ئەوەش ڕوونە کە ئەوە نە ڕێبازی شێخ موحەممەد (١١١٥ ک. تا ١٢٠٦ ک.) و نە شێخ ابن تیمیە (٦٦١ ک. تا ٧٢٨ ک.) و نە شێخ ابن القیم یشە (٦٩١ ک. تا ٧٥١ ک.) وە هیچ لە پێشینیانیش[٦٣]، بەڵکو کۆدەنگییان گواستووەتەوە لەسەر ئەوە).

وە[٦٤] دیسان دەڵێت: (پێمان دەگات و دەبیستین لە گروپانێک، کە گومان و بوختان بە شێخ هەڵدەبەستن و دەکەن کە گوایە وتوویەتی: (هەرکەسێک شیرک بۆ ألله (ﷻ) بڕیار بدات و بتەکان بپەرستێت ئەو کوفر و شیرکەیان بەسەر ناچەسپێت بەدیاری کراویی!) (ئاگادابە! باس لە کافرکردنی کەسی دیاریکراو دەکات)، وە هەندێک لەو کەسانەی قسەم لەگەڵ کردوون لەسەر ئەم شتە، گوێم لە هەندێک برا بوو کوفر و شیرکیان دەچەسپاند لەسەر ئەو کەسەی داوا لە پێغەمبەری خوا دەکات (ﷺ) وە هاواری بۆ دەبات لە دونیادا، واتە کافر و موشریکیان دەکردن، پیاوێک هەستا و وتی: کافر نابێت هەتاکوو نەزانێت (واتە گەر نەزانینی هەبوو ئەوە کافر ناکرێت!) کە دیارە ئەوەش **قسەیەکی پووچە**).

٧) سلیمان بن سحمان (١٢٦٦ ک. تا ١٣٤٩ ک.) دەڵێت: (إن الشرك الأكبر من عبادة غير الله وصَرَفِها لمن أشركوا به مع الله من الأنبياء والأولياء والصالحين، فإن هذا لا يُعذر أحد في الجهل به، بل معرفَتِهِ والإيمانِ به مِنضروريات الإسلام)[٦٥]، واتە: (شیرکی گەورە لە پەرستنی جگە خوای رب العالمین، وە پەرستشەکان بۆ جگە ألله (ﷻ) لەگەڵ ألله دا (ﷻ)، جا ئەو کەسەی کە پەرستشەکەی بۆ دەکرێ لەگەڵ خوای پەروەردگار لە پێغەمبەران (درووود و سەلامیان

(٦٣) سەرنج بدە ڕەحمەتو لێوێ، بزانە چۆن ئیسحاق آل الشیخ باسی ئەوە دەکات کە جیاوازی دەکرێت لە نێوان وتە و خاوەنەکەی و بە (بدعة) و داهێنانی ناو دەبات، وە باسی ئەو بوهتانانە دەکات کە پۆزشدەران، ئەوانەی پۆزشت بە نەزانین دەدەن بە کەسانێکی هاوەڵ بڕیاردەر و موشریک، دەیکەن بۆ ابن عبدالوهاب و ابن تیمیە و ابن القیم.

لەناو خۆشماندا دەبیستین و دەبینین لە کەسانێک کە جیاوازی دەکەن لە نێوان وتە بیروباوەڕ یان وتە یان کردارێکی کوفریی و خاوەنەکەی، دەڵێن: (هاوارکردنە جگە ألله (ﷻ) کوفرە، بەڵام مەرج نییە ئەوەی هاواری کرد کافر ببێت، لا دینی کوفرە، بەڵام مەرج نییە ئەوەی لا دین بوو کافر ببێت).

ئەڵێین: سبحان الله!، ئەوە وەک ئەوە وایە بڵێیت: (ئەوەی کافر بێت کافرە، بەڵام مەرج نییە کافر بێت)!.

(٦٤) هەر لە هەمان (رسالة) وە پەرتووکی: فتاوى الأئمة النجدية - بەرگی: ٣ - لاپەڕە: ١١٦ شدا هاتووە.

(٦٥) كشف الشبهتين - لاپەڕە: ٦٤.

لەسەربێت) یان دۆستانی خوای رب العالمین یان پیاوچاکان بن، ئەوانە هیچکامیان پۆزشتیان نییە بەهۆی نەزانینیانەوە، بەڵکو ناسینی و باوەڕپێهێنانی (خوای تعالی) لە پێویستییەکانی ئیسلامە).

٨) عبدالعزیز بن عبدالله بن باز (١٣٣٠ ک. تا ١٤٢٠ ک.) دەڵێت: (الأمور قسمان: قسم يعذر فيه بالجهل، وقسم لا يعذر فيه بالجهل. فإذا كان من أتى ذلك بين المسلمين وأتى الشرك بالله وعبد غير الله فإنه لا يعذر، لإنه مقصر لم يسمع ولم يتبصر في دينه، فيكون غير معذور في عبادته غير الله)[٦٦]، واتە: (کارەکە دوو بەشە: بەشێک نەزانین دەبێت بە پۆزشت، وە بەشێکی تر نەزانین پۆزشت نییە، گەر کەسێک لەنێوان موسڵمانان[٦٧] شیرکی بۆ خوای رب العالمین (ﷻ) بڕیاردا وە پەرستنی بۆ جگە خوای پەروەردگار (ﷻ) ئەنجامدا، ئەوە نەزانین تێیدا پۆزشت نییە، لەبەر ئەوەی کەم تەرخەم بووە، وە نەیویستووە ببینێت، ئەوە پۆزشتی نییە پەرستن بۆ جگە خوای رب العالمین (ﷻ) ئەنجام بدات).

لێرەوە وتەکانی (فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء)ە[٦٨] :

٩) لیژنەی هەمیشەیی فەتوا دەڵێن: (كل من آمن برسالة نبينا (ﷺ) وسائر ما جاء به في الشريعة إذا سَجَدَ بعد ذلك من ولي وصاحب القبر أو شيخ طريق **يُعتَبَرَ كافراً مُرتَداً عنِ الإسلامِ مُشركاً مع اللهِ غيرهِ في العبادة**، ولو نطق بالشهادتين وقت السجوده، لإتيانِهِ بما ينقض قوله من سجود لغير الله، لكنه **قد يعذر لجهله فلا تنزل به العقوبة حتى يُعلم وتُقام عليه الحجة** ويمهل ثلاثة أيام، إعذاراً إليه ليراجع

(٦٦) مجموع فتاوى بەرگی: ٤ لاپەڕەی: ٢٦ و ٢٧.
(٦٧) سەرنج بدە ڕەحمەتو لێوێ، دەڵێ: لەناو موسڵمانان!، واتە (نشأ ببادية البعيدة) نییە، تاکوو پۆزشتی هەبێ، دووبارە بگەڕێرەوە بۆ تمهید ەکە.
(٦٨) فەتواکانم لە پەرتووکی [فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء - جمع وترتيب: الشيخ أحمد بن عبدالرزاق الدويش - المجلد: الأول - المجموعة الأولى - العقيدة - مؤسسة الأميرة العنود بنت عبدالعزيز آل سعود الخيرية] گواستۆتەوە.

نفسه، عسى أن يتوب، فإن أصر على سجوده لغير الله بعد البيان قتل لردته، لقول النبي (ﷺ): (من بدل دينه فاقتلوه) أخرجه الإمام البخاري في صحيحه عن ابن عباس رضي الله عنهما، **فالبيان وإقامة الحجة للإعذار إليه قبل الإنزال العقوبة به، لا ليُسمى كافرا بعد البيان، فإنه يسمى: كافرا بما حدث منه** من سجود لغير الله أو نذره قربة أو ذبحه شاة مثلا لغير الله، وقد دل الكتاب والسنة على أن من مات على الشرك لا يغفر له ويخلد في النار لقوله: (مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ ۚ أُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ)(٦٩). وبالله التوفيق، وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم)(٧٠)، واته: (هەرکەسێک باوەڕی بە پەیامی پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) هێنابێت، وە باوەڕی بە گشت ئەوەشی هێناویەتی لە شەریعەت، گەر پاش ئەوە کڕنووشێک بەرێت بۆ جگە خوای رب العالمین (ﷻ) جا بۆ (ولي) (واتە: دۆستی خوای رب العالمین (ﷻ)) یان خاوەن گۆڕێک یان شێخی (طریقة(٧١)) بێت، **ئەوە بێ باوەڕە و کافرە وە هەڵگەڕاوەیە مورتەددە، هیچی لە ئیسلام نەماوە و هاوەڵ بڕیاردەر و موشریکیشە**، چونکە کەسانێکی کردووەتە هاوبەش لەگەڵ خوای رب العالمین (ﷻ)، وە جگە لەوانەش لە پەرستشەکان، ئەگەر هاتوو ئەو کەسە لەکاتی کڕنووش بردنەکەی دوو گەواهییەکەش بڵێ، لەگەڵ ئەوەدا کڕنووشی بۆ جگە خوای تعالی بردووە (ﷻ)، بەڵام **پۆزشتی دەبێت بەهۆی نەزانینەوە بەوەی کە هیچ سزایەکی لەسەر جێبەجێ ناکرێت تاکوو بەڵگەی لەسەر بەرپا نەکرێت**، وە سێ ڕۆژ وازی لێ دەهێنرێت دەکرێت، وەک پۆزشتێک بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ خۆیدا، بە ئومێدی ئەوەی پەشیمانی دەرببڕێت و بگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر سوور بوو لەسەر کڕنووش بردنەکەی بۆ جگە خوای رب العالمین (ﷻ)، ئەوە دەکوژرێت و سزای هەڵگەڕاوەی لەسەر جێبەجی دەکرێت، ڕوون کردنەوە و بەڵگە بەرپاکردن بۆ کەسێکە پۆزشتی قبووڵ کراوە لە پێناو ئەوەی سزای نەکەوێتە سەر، پێی ناوترێ

---

(٦٩) التوبة : ١٧.

(٧٠) پرسیاری ژمارە: ٤٤٠٠ بە سەرۆکایەتی: (عبدالعزیز بن عبدالله بن باز) وە بە جێگرێتی: (عبدالرزاق عفیفي) وە بە ئەندامێتی: (عبدالله بن قعود) - باب: السجود لغیر الله - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ١٦٤.

(٧١) طریقة واتە: (ڕێباز ، ڕێگە ، ڕێڕەو ، باوەڕ ، ئاین)، بڕوانە: [فەرهەنگی دەریا - م، ڕزگار کەریم - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٦٣٧].

کافر لە پاش ڕوونکردنەوە، بەڵکو بە هۆی کڕنووش بردنەکەی بۆ جگە خوای تعالى (ﷻ)، کافری دەکەین، جا نەزر یان قوربانی بۆ جگە خوای رب العالمين (ﷻ) حوکمی وەک ئەوەیە[72]. وە بەڵگەش لە قورئان و فەرموودە هەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێک لەسەر شیرک بمرێت خوای پەروەردگار (ﷻ) لێی خۆش نابێت و بۆ هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخ دەیهێڵێتەوە. بەڵگەش خوای رب العالمين (ﷻ) دەفەرموێت: (بۆ کەسانی موشریک و هاوەڵ بڕیاردەر ڕەوا و دروست نییە کە مزگەوتەکانی خوای رب العالمين (ﷻ) ئاوەدان بکەنەوە، کە لەکاتێکدا کە بە خۆیان شایەتی کافرێتی خۆیان دەدەن، کار و ڕەفتاریان هی کافر و بت پەرستانە، ئەوانە بۆ هەمیشە کاروکردەوەکانیان پووچەڵە، وە بە بەردەوامیش لەئاگری دۆزەخدان (پەنا دەگرین بە اللهِ (ﷻ))).

١٠) لیژنەی هەمیشەی فەتوا دەڵێن: (لا يعذر المكلف بعبادة غير الله أو نذره لغير الله ونحو ذلك من العبادات التي هي من اختصاص الله إذا كان في بلاد غير إسلامية ولم تبلغه الدعوة فيعذر لعدم البلاغ لا لمجرد الجهل، لما رواه مسلم عن أبي هريرة عن رسول الله (ﷺ) أنه قال: (والذي نفس محمد بيده لا يسمع بي أحد من هذه الأمة يهودي ولا نصراني ثم يموت ولم يؤمن بالذي أرسلت به إلا كان من أصحاب النار)[73]، فلم يعذر النبي (ﷺ) من سمع به ومن يعيش في بلاد إسلامية قد سمع بالرسول (ﷺ) فلا يعذر في أصول الإيمان بجهله، أما من طلبوا من النبي (ﷺ) أن يجعل لهم ذاتُ أنواط يعلقون بها أسلحتهم فهؤلاء كانوا حديثي عهد بكفر وقد طلبوا ولم يفعلوا فكان ما حصل منهم مخالفا للشرع، وقد أنكره عليهم النبي (ﷺ) فلم يفعلوه)[74][75]، واتە: (پۆزشت و بیانوو نییە بۆ بەرپرسیار (لەڕووی

(٧٢) ئێمە لە تێبینی دکە باسمان کرد کە ئەم پەرستشانە لە بابەتە ئاشکراکانن، ئەو بابەتانەی کە پۆزشت نییە لەمانەدا بە نەزانین، بگەڕێرەوە بۆ تێبینی دکە!.

(٧٣) صحيح مسلم: كتاب: الإيمان - باب: وجوب الإيمان برسالة نبينا محمد(ﷺ) إلى جميع الناس ، ونسخ الملل بملته - فەرموودەی: ١٥٣ - لاپەڕە: ٨٠.

(٧٤) لە [لاپەڕە: ٣٧٤ - فەتوای ژمارە: ٩٢٦٠] دەڵێ: (أنهم لو فعلوا ما طلبوا)، واتە: (گەر ئەوەی دوایان کرد ئەنجامیان بدایە، کافر دەبوون).

شەرعەوە، واتە: ئەو کەسەی بەرپرسیاریّتی لەسەرە لە شەرعدا)، بە پەرستش بۆ جگە خوای تعالی (ﷻ) یان بە نزیک بونەوە لە جگە خوای تعالی (ﷻ) بە سەربڕین و قوربانی کردن، یان نەزر بۆ جگە خوای تعالی (ﷻ) وە لەو شێوە پەرستشانە کە تایبەتن بە خوای تعالی (ﷻ)، مەگەر ئەو کەسە لە شوێنێک بێت کە ئیسلام و موسڵمانانی لێ نییە"[76] و بانگەشەی تەوحید و ئیسلامی پێ نەگەشتووە، ئەمانە پۆزشتیان بۆ هەیە لەبەر ئەوەی بانگەوازییان پێ نەگەشتووە، نەک لەبەر ئەوەی نەزانینیان هەیە"[77]، وەک مسلم بن حجاج (٢٠٦ ک. تا ٢٦١ ک.) لە پێشەوا ئەبو هورەیرەوە (٢١ پ.ک. تا ٥٩ ک.) (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ڕیوایەت دەکات، کە دەفەرموێت: (سوێند بەوەی نەفسی موحەممەدی بەدەستە (ﷺ)، کەس گوێی لێم نابێت لە جوولەکە و گاور، پاشان دەمرێ و باوەڕ ناهێنێ بەو پەیامەی هێناومە ئیللا لە ئاگردایە). پێغەمبەر (ﷺ) پۆزشتی نەداوە بەوەی ئەیبیستێ، وە بەوەش لەناو موسڵماناندایە کە گوێبیستی پێغەمبەری خوا دەبێت (ﷺ)، پۆزشت نییە لە بنچینەکانی ئیمان"[78] (واتە: دوو گەواهییەکە). هەرچی دەربارەی داواکردنەکەی ئەو هاوەڵانە هەیە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە (ذات أنواط)[79]یکیان بۆ دانێ تا چەکەکانیانی پێدا هەڵواسن، ئەوانە، واتە ئەو هاوەڵانە، تازە موسڵمانبوو بوون و لە کوفرەوە نزیک بوون وەک لە باوەڕ و ئیسلام، وە تەنها داوایان کرد، ئەنجامیان نەدا، تاکو پێچەوانەی شەرع بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لێکردن و ئەوانیش ئەنجامیان نەدا).

---

(٧٥) ژمارەی پرسیار: ٤١٤٤ بە سەرۆکایەتی: (ابن باز) وە جێگری سەرۆک: (عبدالرزاق عفیفی) وە ئەندامێتی: (عبدالله بن غدیان و عبدالله بن قعود) - باب: الإستغاثة ودعاء غیر الله - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ٦٧.

(٧٦) واتە: نشأ ببادية البعيدة عن المسلمين، واتە: جێیەکی دوور لە موسڵمانان.

(٧٧) ڕەحمەتو لێوێ سەرنج بدە وتەکەی ابن باز.

(٧٨) ئێمە لە ﷺ وکە باسمان کرد کە نەزانین پۆزشت نییە لە بنەڕەتی دین، کە دووگەواهییەکەیە.

(٧٩) واتە: (خاوەن چڵ و پۆپەکە).

١١) ئەو لیژنەیە لە وەڵامی پرسیارێکدا کە ئەمە دەقی پرسیارەکەیە: (رجل **أمي** لا يقرأ ولا يكتب ويقول: لا إله إلا الله محمد رسول الله (ﷺ)، ولكن يتوسل بغير الله ويقول: المدد يا بدوي ويا حسين، أو ينذر لغير الله عز وجل ويتمسح بالقبور، ووقع في الشرك الأكبر وليس أصغر، فهل يجوز أن نقول عنه: أنه مشرك؟ أو نقول: أنه جاهل بالتوحيد، ولا نحكم عليه بالكفر، وهل يجوز الصلاة ومناكحته وأكل ذبيحته، لأنه يسمي ويذكر اسم الله عليها؟ نرجو من فضلتكم الإجابة وفقكم الله)[٨٠]، واتە: (پیاوێکی **نەخوێندەوار**، کە ناخوێنێتەوە و ناشنوسێ وە دەڵێ: **لا إله إلا الله محمد رسول الله** (ﷺ)، بەڵام تەوەسول دەکات بە جگە خوای **رب العالمين** (ﷻ) و دەڵێ: (هاوار ئەی بەدەوی، وە هاوار ئەی حوسەین (نعوذ بالله)) یان نەزر دەکات بۆ جگە خوای **رب العالمين** (ﷻ) وە (مسح)ی قەبر دەکات و دەستی پێدا دەهێنێت، وە کەوتووەتە ناو شیرکی گەورەوە و شیرکەکەی بچووک نییە، ئایا دروستە پێی بڵێین: ئەو موشریکە؟ یان بڵێین: ئەو نەزانە بە تەوحید، وە حوکم نەدەین بەسەریدا بە کوفر؟ ئومێدەوارین لە جەنابتانەوە وەڵامێکمان دەست بکەوێت). جواب:

(دعاء غير الله شرك أكبر، قال تعالى: (وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ)[٨١]، وقال جل شأنه: (وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ)[٨٢]، والتوسل: منه ما هو الشرك، ومنه ما هو محرم وبدعة، مكلَهُمَا ممنوعة. وأما التمسح بالقبور فمحرم وشرك ومن وقع في شيء من الشرك فإنه يبين له الحكم ويقرن بالدليل: فإن تابَ ورجع فالحمدلله، وإن أصر على ما هو عليه من الشرك فإنه يحكم بكفره، ولا تجوز الصلاة خلف المشرك ولا مناكحته ولا أكل ذبيحته وإن سُميَ وذكر اسم الله)، دەڵێن: (نزا و پاڕانەوە لە جگە خوای **رب العالمين** (ﷻ) شیرکی گەورەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (هەرکەسێک لەگەڵ خوای **رب العالمين**

---

(٨٠) پرسیاری ژمارە: ٦٣١٠ بە سەرۆکایەتی: (عبدالعزيز بن عبدالله بن باز) وە بە جێگرێتی: (عبدالرزاق عفيفي) وە بە ئەندامێتی: (عبدالله غديان) - باب: الإستغاثة ودعاء غير الله - بەرگی: ١ - لاپەرە: ٧١.

(٨١) المؤمنون : ١١٧.

(٨٢) يونس : ١٠٦.

(ﷻ) هاوار و هانا ببات لە خوایەکی تر ئائەوە هیچ بەڵگەیەکی پێ نییە بۆ ئەو کارەی، وە بەبێ گومان حسابی لای خوای تعالی یە (ﷻ)، وە کافرەکان بێگومان سەرفراز نابن). وە خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرمویێت: (داوا لە جگە خوای رب العالمین مەکە کە سودت پێ ناگەیەنێت و زیانت لەسەر لانابات، گەر بێتو ئەنجامتدا ئائەوکات بێگومان تۆ لە ستەمکارانیت). وە (توسل[83]): هەیەتی شیرکە، وە هەیەتی داهێنراو و تاوانە، وە هەردووکیان قەدەغەکراون، وە (مەسح)ی قەبر و گۆڕ تاوانە و شیرکە. وە هەرکەس بکەوێتە شتێک لە شیرک ئەوە بۆی روون دەکرێتەوە حوکمەکەی[84] و بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە، گەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە، ئەوە الحمدلله، وە گەر سوور بوو لەسەر ئەوەی لەسەریەتی، ئەوە حوکم دەدرێت بە کوفرەکەی، وە دروست نییە نوێژ لە پشتییەوە بکرێت وە هاوسەرگیری لەگەڵیدا دروست نییە، وە خواردنی سەربڕاوی دەستی دروست نییە گەر ناوی اللّٰه (ﷻ) یش بهێنێ لەکاتی سەربڕینی دا).

١٢) عبدالعزیز بن باز (١٣٣٠ ك. تا ١٤٢٠ ك.) لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا: (يقع كثير من **العامة** في جملة من مخالفات القادحة في التوحيد فما حُكمهم؟ **وهل يعذرون بالجهل؟** وحكم مناكحتهم وأكل ذبائحتهم؟ وهل يجوز دخولهم مكة المكرمة؟)[85]، واتە: (زۆر لە **نەزانەکان** دەکەونە بەشێک لەسەرپێچییەکان لە تەوحید، ئایا حوکمیان چییە؟، ئایا **پۆزشت بە نەزانینیان بۆ هەیە؟**، وە حوکمی هاوسەرگیری کردن لەگەڵیان چییە؟، وە ئایا دروستە بچنە مەککەی پیرۆزەوە؟). جواب (دەڵێت): (من عُرِفَ بدعاء الأموات، والإستغاثة بهم، والنذر لهم، ونحو ذلك من أنواع العبادات فهو **مشركٌ كافرٌ** لا تجوز مناكحته، ولا دخوله المسجد الحرام، ولا معاملته معاملة المسلمين **ولو ادعى**

---

(٨٣) توسل واتە: (پاڕانە ، لاڵانەوە ، تکاکردن ، داواکردن)، بڕوانە: [(فەرهەنگی نۆبەرە - گیو موکریانی - لاپەڕە: ٩٩) و (فەرهەنگی دەریا - م. ڕزگار کەریم - بەرگی: ١ - لاپەڕە: ١٥٢)].

(٨٤) بزانە ڕەحمەتو لێوێ، ابن باز دەڵێ: (حوکمەکەی)، نەوەکو بەو کردارەی کافر نابێت!، لە فەتواکانی دیکەیدا دەردەکەوێت.

(٨٥) تحفة الإخوان بأجوبة مهمة تتعلق بأركان الإسلام - لاپەڕە: ٣٣.

**الجهل** حتى يتوب إلى الله عز وجل لقول الله عز وجل في سورة البقرة (وَلَا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا ۚ وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُولَٰئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ ۖ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ)[٨٦] الآية، وقوله سبحانه في سورة الممتحنة (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ۖ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنْفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنْفَقُوا ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)[٨٧]، ولقوله عز وجل في سورة التوبة (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا)[٨٨] الآية. **ولا يلتفت إلى كونهم جهالاً**، بل يَجبُ أن يُعاملوا معالمة الكفار حتى يتوبوا إلى الله من ذلك، لقول الله سبحانه في أمثالهم: (وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۞ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ۞ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ ۗ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ)[٨٩]، ولقول الله عز وجل في النصارى وأمثالهم: (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ۞ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا)[٩٠]. والآيات في هذا المعني كثيرة). واته: (هەرکەس زانرا پێی کە دوعای کردووە لە مردووان، وە هاواری کردووە لێیان، وە نەزری کردووە لەوان، وە لەم جۆرە

(٨٦) ئایەتی: ٢٢١.
(٨٧) ئایەتی: ١٠.
(٨٨) ئایەتی: ٢٨.
(٨٩) الأعراف : ٢٨ بۆ ٣٠.
(٩٠) الکهف : ١٠٣ و ١٠٤.

پەرستشانە، ئەوە **موشریکە کافرە**، دروست نییە هاوسەرگیری کردن لەگەڵیان، وە چوونیان بۆ مزگەوتی حەڕام، وە دروست نییە مامەڵە بکرێ لەگەڵیان بە مامەڵەیەکی موسڵمانانە، خۆ **گەر بانگەشەی نەزانینیش بکات**، هەتا دەگەڕێتەوە و داوای لێخۆشبوون دەکات لە ﷲ (ﷻ)، بەڵگەش وتەی خوای پەروەردگارە (ﷻ): (ژنانی (موشریکان مارە مەکەن هەتا باوەڕ دەهێنن، بەڕاستی کەنیزەکێکی بڕوادار لە ژنێکی موشریک باشترە، گەرچی ئەم ئافرەتە موشریکە ماڵ و جوانیی و داراییەکەی سەرسامت بکات، ژنان و کچانی باوەڕدار لە موشریکان مارە مەکەن تا نەبنە خاوەن باوەڕ، بێگومان بەندەیەکی باوەڕدار لە پیاوێکی ئازادی (موشریک باشترە، هەرچەند ئەو موشریکە قەد و قافە و جوانییەکەی سەرسامت بکات، چونکە بەڕاستی ئەو موشریکانە ئێوە بۆ ئاگر بانگ دەکەن، وە خوای رب العالمین (ﷻ) ئێوە بۆ بەهەشت و لێبوردەیی بانگ دەکات، وە ﷲ (ﷻ) بەڵگە و نیشانەکانی خۆی بۆ خەڵک ڕۆشن دەکاتەوە تا خەڵکی بیربکەنەوە و ئامۆژگاری وەربگرن)[٩١]. وە وتەی خوای رب العالمین (ﷻ) کە دەفەرموێت: (ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، ئەگەر ئافرەتێ بە باوەڕی تەواوەوە گەشتە لاتان، بیانخەنە بەر ئەزموونەوە و پرسیاری لێ بکەن، خوای پەروەردگار (ﷻ) لە بیروباوەڕیان ئاگادارترە، گەر ناسیتانن بەڕاستی باوەڕدارن، بۆلای هاوەڵ بڕیاردەران مەیاننێرنەوە، نە ئەمان بەوان دەشێن نە ئەوانیش بەمان دەشێن، هەرچیش بەختیان کردووە، بیاندەنەوە، گەر ئێوە مارەیان بکەن و مارەییەکەیان بدەنێ، هیچ گوناهێکتان ناگاتێ، ئافرەتانی هاوەڵ بڕیاردەرەکانیش لای خۆتان گل مەدەنەوە، هەرچیشتان لێ بەختکردوون بیسێننەوە، با ئەوانیش هەرچیەک بەختیان کردووە داوای بکەن، ئەمە یاسای خوای رب العالمین ە (ﷻ)، کە بە نێوانتان ڕادەگات خوای پەروەردگار زانا و کارزانە)[٩٢]، وە وتەی خوای رب العالمین (ﷻ) کە دەفەرموێت: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە چاک بزانن کە ئەو موشریکانە پیسن، جا دوای ئەمساڵە (کە ساڵی نۆیەمی کۆچییە) نابێ نزیکی کەعبە بکەون... تا کۆتایی ئایەتەکە)[٩٣]. **وە ئاوڕیان لێ نادرێتەوە بەوەی کە**

(٩١) البقرة : ٢٢١.
(٩٢) الممتحنة : ١٠.
(٩٣) التوبة : ٢٨.

**نەزانن**، بەڵکو پێویستە مامەڵە بکرێ لە گەڵیان بە شێوازی مامەڵەکردنی کافران. هەتا دەگەڕێنەوە بۆ لای اللَّهُ (ﷻ)، لەبەر وتەی خوای رب العالمین (ﷻ) کە دەفەرمویێت: ‹ئەو هاوەڵ بڕیاردەرانە ئەگەر هاتوو داوێن پیسی و بەد ڕەوشتییەکیان لێ ببینرایە ئەیان وت: ‹باو و باپیرانمان وا دیوە و ئەوان وایان کردووە، وە خوای پەروەردگاریش فەرمانی پێکردووین وابکەین›، بڵێ: ‹بەڕاستی هەگیز خوای پەروەردگار (ﷻ) فەرمان ناکات بە داوێن پیسی و بەد ڕەوشتیی، چۆن لەسەر اللَّهُ (ﷻ) شتی ناحەق دەڵێن و شتی نەشیاو هەڵدەبەستن، کە ئاگاتان لێی نییە و نازانن کە ڕاستە› ❁ بڵێ: ‹پەروەردگارم فەرمانی پێکردووم بە دادگەری نەک بە بەد ڕەوشتیی، وە لەکاتی هەموو کڕنووش و نوێژێکدا تەنها ڕوو لە اللَّهُ (ﷻ) بکەن و خۆتان یەکلا بکەنەوە بۆ ئەو، بەدڵێکی پاکەوە بەردەوام لەو بانگ بکەن، هەر ئەو بپەرستن، بزانن هەروەک لەسەرەتاوە ئێوەی لە نەبوونەوە هێنایە بوون، ئاوهاش زیندووتان دەکاتەوە و دەگەڕێنەوە بۆلای ئەو زاتە› ❁ دەستەیەکیانی ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگای ڕاست و دروست و بەڕێی چاکدا چوون وە دەستەیەکیشیان بە هۆی کار و کرداری خۆیانەوە گومڕابوونیان لەسەر چەسپا، چونکە ئەوان لەباتی اللَّهُ (ﷻ)، شەیطانیان کردە یاریدەدەر و دۆستی خۆیان، وە واشیان زانی کە لەسەر حەق و ڕاستین›[٩٤]. وە وتەی خوای رب العالمین (ﷻ) کە دەفەرمویێت لە باسی گاوڕ و هاوشێوەکانیان: ‹بڵێ: ئایا پێتان بڵێم زیانبارترین کەس کێیە لای اللَّهُ (ﷻ)؟ ❁ ئەوانەن کە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان لەم ژیانی دونیایەدا بەهەوانتە و بێ ناوەڕۆک چوون، چونکە کافر و بێباوەڕ بوون و هەرچییەکیشیان کردبێ لێیان وەرنەگیراوە›[٩٥]. وە ئایەتەکان لەم جۆرە واتانە زۆرن[٩٦].

---

(٩٤) الأعراف : ٢٨ تا ٣٠.

(٩٥) الكهف : ١٠٣ و ١٠٤.

(٩٦) ئەوەندە فەتوای ابن باز بەسە، هەر موسڵمانێکی بەڕێز ئارەزوو دەکات زیاتر ئاشنابێت بە فەتواکانی، با ئەگادارمان بکاتەوە بە پێی توانا فەتواکانی ابن باز ی بۆ دەگوازینەوە لەسەر ئەم بابەتە إن شاء الله، وە بە ویستی خوای رب العالمین لە ڕاڤەی دەروازەی حەوتەمی ‹الرسالة إلى الإخوان - نامەیەک بۆ برایان› زیاتر باسی ئەم بابەتە و فەتواکانی بن باز دەکەین، گەر اللَّهُ (ﷻ) ویستی لەسەر هەبێت.

# دەروازەی پێنجەم:

# گومانەکان و وەڵامدانەوەیان

## گومانی یەکەم: (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا):

خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرموێت: (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[٩٧]. واتە: (**سزای** هیچ کەسێک نادەین تاکو پێغەمبەریان بۆ نەنێرین).

**دەڵێن:** (خوای پەروەردگار (ﷻ) بەرپابوونی بەڵگەی بە مەرج داناوە لەکافرکردنی ئەوانەی لە کوفر و شیرکدان)!.

لە وەڵامدا **بە پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (ئەگەر تێڕابمێنین لە ئایەتەکە، خوای رب العالمین (ﷻ) باسی سزا دەکات، دەفەرموێت سزای ئەهلی کوفر و شیرک نادەین هەتا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین، نەوەکو باسی ئەوەی پێیان ناوترێ کافر یان موشریک، چونکە ئاشکرایە پێش پێ گەشتنی بەڵگە و دوای پێ گەشتنی بەڵگە (گەر نکۆڵیکار بوون) دەتوانین بەوانەی لە ناو کوفر و شیرکدان بڵێین: کافر یان موشریک).

١) خوای رب العامین (ﷻ) دەفەرموێت: (لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنْفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ)[٩٨]. واتە: (ئەوانەی کوفریان کرد لە گاور و هاوەڵ بڕیاردەران و گۆڕپەرستان دەستیان هەڵنەگرت لە کوفر و شیرکەکانیان تا بەرچاوڕوونیان بۆ هات، کە بریتیبوو لە ئایەتی دووەمی هەمان سوورەت، کە دەفەرموێ: (پێغەمبەرێکیان بۆ هات (ﷺ) لەلایەن خوای تعالی وە، کە پەرتووکێکی پاک و بێگەردی دەخوێندەوە لە ناویاندا).

---

(٩٧) الأسراء : ١٥.
(٩٨) البينه : ١.

٢) خوای رب العامین (ﷻ) دەفەرمویێت: (وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ)[٩٩]. واتە: (گەر یەکێک لە **هاوەڵ بڕیاردەران** هات بۆ لات و داوای پاراستنی لێت کرد، داڵدەی بدە تا گوێبیستی وتەی خوای رب العالمین دەبێت (ﷻ) پاشان ئەمانی بدەرێ چونکە ئەوانە گەل و قەومێکی **نەزانن**).

کەواتە لە دادپەروەری خوای رب العالمین وایە (ﷻ) کە سزای هیچ گەلێک نادات، ئیتر لە دوارۆژدا یان لە دونیادا بەوەی دەوڵەتی ئیسلام جیهادیان ناکات تا دینی خوای تعالى یان پێ نەگات، وەک لە فەرموودەی دروستی موسلیمدا (٢٠٦ ک. تا ٢٦١ ک.) بۆمان باس کردن، کە ابن باز باسیکرد بۆمان.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە پێشەوا عەلی (٢٣ پ. ک. تا ٤٠ ک.) (ﷺ): (فوالله لإن يهدي الله بك رجلا واحدا خيرٌ لك من حُمرِ النعم)[١٠٠]، واتە: (واللەی ئەگەر تەنها یەک کەس لەسەر دەستت موسڵمان ببێت و هیدایەت وەربگرێ لە وشتری سوور باشترە بۆت). واتە پێی فەرموو هێرش مەکە سەریان تا دینی خوای رب العالمین یان پێ دەگەیەنیت. بەڵام مانای وا نییە ئەوانە بێ باوەڕ و هاوەڵ بڕیاردەر نین **بە ناو**، نا بەڵکو **بە ناو** هاوەڵ بڕیاردەرن، بەڵام سزا جێبەجێ نابێت تا (إقامة الحجة) نەکرێت.

(٩٩) التوبه : ٦.
(١٠٠) مُتَّفَقٌ عليه.

## گومانی دووەم: فەرموودەی (پیاوەکەی نەوەی ئیسرائیل):

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسێکی تاوانبار هەبوو کاتێ سەرەمەرگی هاتە پێش بە منداڵەکانی وت: (کە مردم بمسوتێنن، پاشان وردم بکەن، پاشان بمکەن بە خۆڵەمێش و بەهەوادا بڵاوم بکەنەوە، واللەی ئەگەر زیندوو ببمەوە خوای رب العالمین سزایەکم دەدات کە سزای کەسی وەها نەدابێت)، کاتێک کە مرد ئەوەیان بۆ کرد کە داوای کردبوو، خوای رب العالمین (ﷻ) فەرمانیدا بە زەوی کە هەموو پارچە و خۆڵەمێشی ئەم پیاوە کۆبکەرەوە، دوای کۆکردنەوە، خوای رب العالمین پێی فەرموو: (چی پاڵی پێوە نایت ئەم کارە بکەیت؟)، پیاوەکەش وتی: (یارب **خشیتُکَ**)، واتە: (ئەی پەروەردگارم لە **ترسی** تۆ وامکرد)، وە خوای رب العالمین یش لێی خۆشبوو)[١٠١].

**دەڵێن**: (ئەم پیاوە نەزان بوو بە توانی خوای تعالی کە دوای مردن زیندووی دەکاتەوە بەمەش کافر نەبوو، چونکە عوزر بە جەهلی بۆ هەیە)!.

لە وەڵامدا **بە پشتیوانی ﷲ دەڵێین**: (سەرەتا فەرموودەکە باسی ئەوەی تێدا نییە کە ئەم پیاوە تەرکی تەوحیدی کردووە و کوفر و شیرکی گەورەی هەبووە، بەڵکوو پیاوێکی یەک خواپەرست بووە، لە خوا ترسبووە، باوەڕەکەی و ترسە زۆرەکەی لە خوای پەروەردگار (ﷻ) پاڵی پێوەناوە تا ئەو وەسێتە بۆ منداڵەکانی بکات، ئەگەر باوەڕی بە زیندووبوونەوە نەبوایە و بێ باوەڕ بوایە پێی، هەرگیز ئەم کارەی نەدەکرد).

بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەم پیاوە یەکخواپەرست بووە و ئەهلی تەوحید بووە و شیرکی نەبووە، لە گێڕانەوەکەی أحمد دا (١٦٤ ک. تا ٢٤١ ک.) هاتووە کە دەفەرموێت: (كان رجل ممن قبلكم لم يعمل خيرٌ قطٌ إلا التوحيد)، واتە: (پیاوێک لە سەردەمانی پێش ئێوە هیچ کار و کردەوەیەکی تەواوی وەهای نەبوو، جگە لە تەوحید و یەک خواپەرستییەکەی نەبێت)، پاشان ئەم پیاوە هیچ گومانێکی نەبووە لە توانای خوای رب العالمین لە زیندووبوونەوەدا.

---

(١٠١) صحيح بخاري - كتاب: أحاديث الأنبياء - رقم حديث: ٣٤٨١.

له گێڕانەوەکەی مسلم دا (٢٠٦ ک. تا ٢٦١ ک.) هاتووە کە دەفەرموێت: (وإن الله يَقدِرُ عَلي أن يُعَذِبَني)[١٠٢]، واتە: (بێگومان خوای رب العالمين (ﷻ) دەتوانێت سزام بدات).

پاشان فەرموودەکان و ئایەتەکان و کۆدەنگییەکان زۆرن لەسەر کافرێتی کەسانێک کە گومانیان لە زیندووبوونەوە هەبووە، لە چەندین شوێندا خوای تعالى باسیان دەکات، یەک لەوان خوای تعالى دەفەرموێت: ((هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران وتیان:) ئایا ئەگەر ئێمە بوینەوە بە خۆڵ، چۆن جارێکی تر دروست دەکرێینەوە و زیندوو دەبینەوە؟). ئەوەتا أبي الحسن علي بن أحمد السبتي ناسراو بە إبن خمير (٥٥٠ ک. تا ٦١٤ ک.) کۆدەنگی زانایان دەگوازێتەوە لەسەر کافرێتی هەرکەسێک گومانی هەبێت لەتوانای خوای تعالى لە زیندووی بوونەوەدا[١٠٣].

وە فەرموودەکە هیچ گومانێکی تێدا نییە لەسەر پۆزشت بە نەزانین، خوای رب العالمين کاتێک پرسیار لەم پیاوە دەکات: (چی پاڵی پێوەنایت بۆ ئەم کارە؟)، پیاوەکە دەڵێ: (لەتاو **ترسی** تۆ ئەی پەروەردگارم)، ناڵێت: (من **نەزان** بووم یان گومانم هەبوو دەربارەی دەسەڵات و توانایت لە زیندوو کردنەوەمدا).

بەڕێزان و خۆشەویستان بۆ درێژەدان بە باسەکەمان و ڕاستێتی قسەکانمان، وتەی زانایانتان بۆ دەگوازینەوە لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیە کە بەم چەشنەیە:

١) **ڕێبازی یەکەم:**

دەستەی یەکەم لە زانایان ئەوانەن کە بە ڕووکەشی فەرموودەکە بڕیار دەدەن و دەڵێن: (ئەم پیاوە گومانی هەبووە لە توانای خوای پەروەردگار)، ئەوانیش زانایان:

١) ابن حزم الظاهري (٣٨٤ ک. تا ٤٥٦ ک.).
٢) ابن تيمية (٦٦١ ک. تا ٧٢٨ ک.).
٣) ابن القيم الجوزي (٦٩١ ک. تا ٧٥١ ک.).
٤) ابن أبي العز الحنفي (٧٣٢ ک. تا ٧٩٢ ک.).
٥) ابن الوزير (٧٧٥ ک. تا ٨٤٠ ک.).

(١٠٢) صحيح مسلم - كتاب: التوبة - ژمارە : ٢٧٥٧ - فەرموودەی ژمارە: ٢٤ ی باب ەکە.
(١٠٣) سەیری پەرتووکی: تنزيه الأنبياء عما نسب إليهم حثالة الأغبياء للسبتي - لاپەڕە: ١١٨.

ئەم وتەیە وتەیەکی دروست نییە و ئەو زانایانە نەیانپێکاوە بە بەڵگەی فەرموودەکان و وتەی زانایانی دیکە، إن شاء الله گەر نەفەست درێژ بێت و هەڵبکەی لەگەڵ خوێندنەوەیدا بۆت دەردەکەوێت و زوو بڕیار نادەیت.

٢) **ڕێبازی دووەم:**

هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: (شێوازی قسەکردنەکەی دڵنیایی بووە بە ناوەڕۆک و مەبەست، بەڵام دەربڕینەکەی شک ئامێز بووە).

هەندێک لە زانایان دەڵێن: (شێواز و قسەکردنی ئەم پیاوە لە زمانی عەرەبیدا بەم جۆرە لێکدەدرێتەوە). نەوەوی لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا هەموو ڕا و بۆچوونەکانی هێناوەتەوە، دەڵێت: (دەستە و بەستەیەک لە زانایانی ئیسلام بەم جۆرە لێکیان داوەتەوە)[١٠٤]، وە خوای رب العالمين (ﷻ) یش دەفەرموێت: (وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)[١٠٥]. (فصورة شك، والمراد به اليقين)[١٠٦]. بۆ ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەچینە خزمەت ڕاڤەکەی إبن كثير الديمشقي: (قال ابن كثير الديمشقي في تفسير القرآن العظيم في تفسير هذه الآية: (هذا من باب اللف والنشر، أي: واحد من الفرقين مُبطل، والآخر محق))[١٠٧]. واتە: (ئەمە لە (باب)ی (اللف) پێچان و (النشر) کردنەوەیە لە ڕەوانبێژییدا، واتە یەکێک لەم دوو دەستەیە لەسەر بەتاڵ و ئەوی تریان لەسەر ڕاستییە، چونکە ناگونجێت و ناکرێت ئێمە و ئێوە لەسەر ڕاستیی بین (لە کاتێکدا پێغەمبەران عليهم أفضل الصلاة والسلام بەڵگە و نیشانەیان لەلای ﷲ وە پێبووە، لە بەرامبەردا قەومەکانیان لەسەر پووچیی و لاسار بوون).

(١٠٤) صحيح مسلم - بەرگی: ١٧ - لاپەڕە: ٧١.
(١٠٥) سبأ : ٢٤.
(١٠٦) ئەمە وەک لە پەرتووکی: الشفاء ی قاضي عياض - بەرگی: ٢ - لاپەڕەی: ٢٧٨ دا هاتووە.
(١٠٧) تفسير القرآن العظيم - صفحة: ١٥٦٤ دار: إبن حزم (ئەم چاپە یەک بەرگی قەبارە گەورەیە).

هاوكات هەریەک لە (الشوكاني (١١٧٣ ک. تا ١٢٥٥ ک.) ، قاضي عياض (٤٧٦ ک. تا ٥٤٤ ک.) ، المبرد (٢١٠ ک. تا ٢٨٦ ک.)) ئاوها ئایەتەکەیان ڕاڤە کردووە.

٣) **ڕێبازی سێیەم:**
بەشێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: (ئەم پیاوە لە ئەهلی فەترە بووە).
هەندێک لە زانایان دەڵێن ئەم پیاوە لە ئەهلی فەترە بووە، وەک النووي لە [شرح مسلم]دا دەڵێت: (دەستەیەک لە زانایان بەم شێوەیە دواون لەسەر ئەم فەرموودەیە و دەڵێن: (ئەم پیاوە لە ئەهلی فەترە بووە و (إقامة الحجة)ی (الرسالي[١٠٨]) نەکراوە لە بابەتی زیندووبوونەوەدا.
موسڵمانانی بەڕێز و سەنگین، دەشگونجێ پێش گەیشتنی پەیام و بانگەوازی پێغەمبەرێک (عليه السلام) مرۆڤی ئیماندار نەزان بێت، ئەوەتا دەبینین کاتێک ئافرەتە یەهوودییەکە هات بۆ لای دایکمان عائیشە (رضي الله عنها) بۆ ئەوەی پرسیاری لێبکات، لە کۆتاییدا ئافرەتەکە وتی: (أعاذكِ الله من عذاب القبر)، واتە: (خوای تعالی بتپارێزێت لە سزای گۆڕ) ئەوەبوو دواتر دایکمان عائیشە (رضي الله عنها) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی: (أيعذب الناس في قبرهم؟)، واتە: (ئایا خەڵکی لەناو گۆڕەکانیان سزا دەدرێن؟)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنای بە الله (جل جلاله) گرت لە سزای گۆڕ، وەک وەڵامێک بەڵێ سزای گۆڕ ڕاستە هەیە.
قاضي عياض (٤٧٦ ک. تا ٥٤٤ ک.) زۆر جوان باسی ئەمە دەکات لە پەرتووکەکەیدا[١٠٩] وە هەروەها ابن حجر العسقلاني[١١٠] (٧٧٣ ک. تا ٨٥٢ ک.) یش، وە عبداللطيف آل الشيخ یش (١٢٢٥ ک. تا ١٢٩٣ ک.) دەڵێت: (أما الذي أمر أهله أن يُحرقه ويذروه فهو لم تقم عليه الحجة، وأهل الفترة لا يُقاسون

(١٠٨) نامەیی، واتە: ئایەت یاخود فەرموودەی پێغەمبەری پێ نەگەشتووە، ئەو پێغەمبەرەی کە لەو سەردەمەدا کۆتا پێغەمبەر بوو (ﷺ).
(١٠٩) الشفاء.
(١١٠) فتح الباري - بەرگی: ١٣ لاپەڕە: ٢٩٠.

بغيرهم)[111]، واته: (هەرچی ئەو کەسەی فەرمانی کرد کە بیسوتێنن و خۆڵەمێشەکەی فڕێ بدەن، حاڵی وابوو ئەهلی فەترە بوو وە ئیقامە حوججەی ڕیسالی نەکرابوو، بۆیە قیاسی ئەمانە ناکرێ بە جگە خۆیان).

٤) **ڕێبازی چوارەم:**

بەشێکی تر لە زانایان دەڵێن: (ئەم پیاوە نەزان بووە بە سیفەتێک لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار (ﷻ)).

النووي لە [شرح مسلم] ئەڵێ: (دەستەیەکی تر لە زانایان بەم شێوەیە لێکیان داوەتەوە کە دەڵێن: (نەزان بووە بە سیفەتێک لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار (ﷻ))).

وە زانایانیش ڕا جیاوازییان هەیە لە کافرکردنی (جاهل الصفة) واتە نەزان بە سیفەتێک، وەک النووي ئەڵێ: (وقالت طائفة: هذا الرجل جهل صفة من صفات الله تعالى، وقد اختلف العلماء في تكفير جاهل الصفة، قال قاضي (أي: العياض): وممن كفره بذلك ابن جرير الطبري، وقاله أبو الحسن الأشعري أولا، وقال الآخرون: لا يكفر بجهل الصفة ولا يخروج به عن اسم الإيمان، بخلاف جحدها، وإليه رجع أبو الحسن الأشعري وعليه استقر)[112]، واتە: (وە دەستەیەک دەفەرموون: ئەم پیاوە نەزانینی هەبووە بە سیفەتێک لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار. وە زانایانیش ڕا جیاوازییان هەیە لە کافرکردنی نەزان بە سیفەتێک لە سیفەتەکانی ﷲ (ﷻ).

قاضی عیاض (٤٧٦ ک. تا ٥٤٤ ک.) دەڵێت: (وە ئەوانەی تەکفیری نەزان بە سیفەتی ﷲ (ﷻ) یان کردووە، یەک لەوان ابن جرير الطبري ە (٢٢٤ ک. تا ٣١٠ ک.)، وە ابو حسن الأشعري یش (٢٦٠ ک. تا ٣٢٤ ک.) سەرەتا وای وت، وە زانایانی دواتر دەڵێن: (کەسی نەزان بە سیفەتێک کافر نابێت و دەرناچێ لە ناوی ئیمان، بە پێچەوانەی نکۆڵیکردنی، وە لەسەر ئەمەش ابو الحسن الأشعري پاشگەز بوویەوە لە فەتواکەی کاتی خۆی، وە دانی پێدانا).

---

(١١١) فتاوى الأئمة النجدية - بەرگی: ٣ - لاپەڕە: ١٩٥.

(١١٢) شرح مسلم - بەرگی: ١٧ - لاپەڕە: ٧١.

٥) **ڕێبازی پێنجەم:**

بەشێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: ‹ئەم پیاوە لە شەرعەکەیاندا دروست بووە کافر ببوردرێت›!.

النووي ئەڵێ: ‹دەستەیەک لە زانایان دەڵێن: ‹لە شەرعەکەیاندا بۆی هەیە و ڕێگە پێدراوە کە لە کافر و موشریک خۆشببێت خوای رب العالمين (ﷻ)، بە پێچەوانەی شەرعی خۆمان›، بەڵام ابن حجر[113] (٧٧٣ ک. تا ٨٥٢ ک.) دەڵێت: (وأبعد الأقوال قول: أنه كان في شرعهم جواز المغفرة للكافر) واتە: ‹وە لە دوورترینی وتەکان لە ڕاستیەوە بریتییە لە وتەی: ‹لە شەرعی ئەواندا دروست بووە لێخۆشبوون بۆ کافر››[114].

٦) **ڕێبازی شەشەم:**

دەڵێن: ‹ئەم پیاوە کە ئەم وەسیەتەی کرد لە حاڵەتێکدا بوو کە ئەوپەڕی ترس لە خوای پەروەردگار بوو›.

ئاشکرایە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت کەسێک لە شیددەتی ‹ترس یان دڵخۆشی یان تووڕەبون›دا بێت کوفری لەدەم بێتە دەرەوە لەسەری ناکەوێت، وەک کابراکە کە حوشترەکەی دۆزیەوە، وە وەک ئەم پیاوە[115]، وە النووي دەفەرموێت: ‹دەستەیەکی تر لە زانایان دەڵێن: ‹ئەم پیاوە کە ئەم وەسیەتەی کردووە بیر و هۆشی لای خۆی نەبووە لە تاو ترسی زۆری لە خوای پەروەردگار››.

---

(١١٣) فتح - بەرگی: ١٣ - لاپەڕە: ٢٩٠.

(١١٤) بەرگی: ١٧ - لاپەڕە: ٧٢ - ڕاڤەی صحيح مسلم.

(١١٥) موسڵمانانی بەڕێز و سەنگین ئەمەش بەمەرجێک دەبێت لەوپەڕی ئەو حاڵەتە بێت، نەک لە ‹ترس یان دڵخۆشی یان تورەبوون›ێکی **ئاسایی!**. ئەم حاڵەتە بەجۆرێ لە جۆرەکان یەکدەگرێتەوە لەگەڵ یەکێکی دیکە لە ڕێگرییەکانی کافرکردنی دیاریکراو (موانع تكفير المعين)، کە ئەویش ڕێگریی (مجنون - زوال العقل)، واتە: ‹شێت - ئەوکەسەی ئەقڵی لەدەستداوە›. ئەمەش زانایان دەفەرموون پرسیاری لێ دەکرێ پێی دەوترێ: ‹کوفرت کرد تۆ!›، ئەویش دەڵێ: ‹أستغفرالله، من کەی وام وتووە؟› یان دەڵێ: ‹ئاگام لەخۆم نەبووە›. واتە لەو کاتەدا ئاگای لەخۆی نەبووە کە ئەو کوفرەی لەدەم دەرچووە بۆیە لەسەری ناکەوێت، والله أعلم بالصواب.

قاضي عياض (٤٧٦ ک. تا ٥٤٤ ک.) دەڵێت: (وقيل: قال ما قالَهُ وهو غير عاقل لكلامه ولا ضابط للفظه، مما استولى عليه من الجزع والخشية التي أذهبت لُبه فلم يُؤاخذ به)[١١٦]، واتە: (وتراوە: ئەوەی کە ئەم پیاوە وتوویەتی ئاگای لەخۆی نەبووە وشەکانی پێ کۆنترۆڵ نەکراوە، لەبەرئەوەی ترس زاڵ بووە بەسەریدا و ئەقڵ و بیر و هۆشی نەهێشتۆتەوە بۆیە لێی نەگیراوە).

موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب (١١١٥ ک. تا ١٢٠٦ ک.) لە وەڵامی ئەم شوبهەیەدا دەڵێت: (إنما أخطأ من شدة خوفه، وقد وقع الخطأ في الكثير مِنَ الخلق من هذه الأمة، واتفقوا على عدم تكفير من أخطأ)[١١٧]، واتە: (ئەم پیاوە هەڵەی کرد لەتاو ترسە زۆرەکەی، وە زۆرێک لە خەڵکی هەڵەیان تووشدەبێت، وە یەکدەنگیی هەیە لەسەر کافرنەکردنی ئەو کەسەی کە دەکەوێتە هەڵەوە لەبەر ترسێکی زۆر یان خۆشییەکی زۆر کە ئەقڵی لای خۆی نەمێنێت).

### ٧) ڕێبازی حەوتەم:

هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: (وشەی (قَدَرَ) بە واتای وشەی (ضَيَّقَ) یان (قَضَى) دێت)[١١٨].

ئێمە لەم فەرموودەیە چوار گۆمان هەیە، کە لە صەحیحی بوخاری و موسلیم یەکی دوو گۆمان هەیە.

ئەوەی لە بوخاریدا هەیە لە سێ جێگەدا گێڕاویەتییەوە، لەو سێ جێگەدا تەنها لە یەک جێگەدا دەفەرموێت: (قَدَرَ) لەسەر وەزنی (فَعَلَ) بە واتای: (توانی). لە دوو جێگەکەی تردا بەم شێوەیە هێناویەتی: (قادرٌ علي) (قادرٌ) لەسەر وەزنی (فاعلٌ) بە واتای: (بە توانا).

(١١٦) الشفاء للقاضي عياض - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ٢٧٨.
(١١٧) سەرنج بدە وتەی شێخ.
(١١٨) ئەم خاڵەم بۆیە هێنایە کۆتایی بۆ ئەوەی کۆتا خاڵ بێت و گرنگی پێبدرێ .

ئەوەی لە موسلیمدا هەیە بەم شێوەیەیە: (یَقدروا علي) واتە: ‹توانای هەیە بەسەرمدا›. لە جێگەی دووەمدا لە صەحیحی موسلیمدا بەم شێوەیە هاتووە: (وإن یَقدِمُ علی ربي) واتە: ‹خوای تعالی بگاتەوە پێم›.

وەک گۆ ئەم حەدیثەمان کە ئەمانەن:

١) بەو گۆیە هاتووە کە پێ دەچێ گومانی هەبێ[١١٩].

٢) بەو گۆیە هاتووە کە دژی ئەوەیە کە دەکرێ گومانی هەبێ.

٣) بەو گۆیە هاتووە کە خوای پەروەردگار دەسەڵاتی هەیە بەسەرمدا و سزایەکی توندیشم دەدات.

٤) گۆی کۆتایی ئەوەی تیایە کە دەڵێ من لە خوای تعالی دەترسم پێی بگەمەوە.

ئەم چوار گۆیە سیانیان پشتگیری یەکدی دەکەن و یەک دانەیان دژە بەوانی تر. واتە لەوەی بوخاری سیان هەیە دوانیان دژی ئەم یەک دانەیە، کە ‹عاذري›یەکان یان ئەوانەی پۆزشت دەدەن بە نەزان لە شیرکی گەورەدا، ئەم فەرموودەیە دەکەن بە بەڵگە بۆ پۆزشت بە نەزانین، وە ئەوەی موسلیم دوانە و دژی ئەم یەک دانەی بوخارییە.

گەر باسێکی گۆ و ڕشتەی بوخاری و موسلیم بکەین، ئەوانەی لە زانستی فەرمووده دەزانن و شارەزاییان هەیە، تێدەگەن باسی چی دەکەین، گەر ڕشتەی بوخاری و موسلیم دژی یەکبوو، ڕشتەی بوخاری پێش دەخرێ، بەڵام گەر گۆی بوخاری و موسلیم دژی یەکبوو ئەوا گۆی موسلیم پێش دەخرێ. چونکە پێشەوا موسلیم (ضبط الکتابة)ی هەبوو، وە پێشەوا بوخاری (ضبط الصدر)ی هەبوو، واتە گەر موسلیم فەرموودەیەکی وەربگرتایە لە شێخەکەیەوە، ڕاستەوخۆ لەبەری دەکرد و دەشینوسیەوە، بەڵام بوخاری گەر فەرموودەیەکی لە شێخێکەیەوە ببیستایە لەبەری دەکرد، بەڵام ڕاستەوخۆ نەیدەنوسییەوە[١٢٠]، جا گەر لەبەرکردن و نوسینی ئینسان کۆبکەینەوە، ئەوکات نوسین پێش دەخرێت بەسەر و لەبەرکردن، ئەمە گەر باسی گۆ و ڕشتە بکەین.

---

(١١٩) بەڵام لە ڕاستیدا گومانی نییە، ڕاڤەی ئەمەش دەکەین، إن شاء الله.

(١٢٠) بۆ نموونە گەر بوخاری لە کووفە فەرموودەیەکی وەربگرتایە لە بەصرە دەینوسیەوە.

خۆ ئەگەر باسی کۆی فەرموودەکان بکەین، ئەوکات دەبینین سێ فەرموودەیان دژ بە یەکێکیانە.

خۆ ئەگەر ڕاڤەی وشەی (قَدَرَ) بکەین، دەبینین ئەو وشەیە هیچ واتایەکی کوفریی ناگەیەنێت و نابێت بە بەڵگە بۆ بابەتی پۆزشت بە نەزانین.

زانایانی (معتبر[١٢١])ی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وشەی (قَدَرَ)یان بە (ضَيق) یان (قضى) ڕاڤە کردووە، بەم چەشنە:

١) ابن عبد البر (٣٦٨ ک. تا ٤٦٣ ک.) دەڵێت: (هو القدر الذي هو القضاء، وليس من باب القدرة والإستعانة، كقوله تعالى: (فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ)[١٢٢]، وقيل: بمعنى ضَيَّقَ، كقوله تعالى: (وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ)[١٢٣]، انتهى كلامه). واتە: (ئەو وشەی (قدر)ە بە واتەی (قضاء) یەت، لە (باب)ی توانا و دەسەڵات نییە، هەروەک خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرموێت: (فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ) ئەم ئایەتە باسی پێغەمبەر یونس دەکات (عليه السلام) کەوا گومانی برد کە زەوی لێ تەسک ناکەینەوە، جا پێغەمبەر یونس (عليه السلام) زۆری بە قەوم و گەلەکەی وت گوێڕایەڵیان نەکرد، ئیتر ئەویش تووڕەبوو وە سەفەری کرد بۆ ئەوەی بچێ بانگەوازییەکەی بگوازێتەوە و بڵاوبکاتەوە و لەناو گەلێکی تر بانگەوازی بکات، وای بە باش زانی و وایزانی زەوی فراوانە، وای گومان برد خوای تعالی زەوی لێ تەسک ناکاتەوە، وە دەڵێت: (دەگوترێ: بەمانای (ضيق) دێت (واتە: توند بوون). هەروەک خوای پەروەردگار (ﷻ) دەفەرموێت: (وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ) ئەم ئایەتە باسی ئەو کەسە دەکات کە (نفقة) خەرجی دەکێشێت، خوای تعالی دەفەرموێ: (با بە گوێرەی ڕزقەکەی خەرجی بدات و لەسەر خۆی **توند** نەکات (واتە: (ضيق) نەکات)).

---

(١٢١) معتبر واتە: (گرنگ ، بایەخدار ، پەیڕەوی لێکراو)، بڕوانە: [فەرهەنگی شیرینی کوردی - فازیل نیزامەدین - لاپەڕە: ١١٦٧].
(١٢٢) الأنبياء : ٨٧.
(١٢٣) الطلاق : ٧.

٢) القسطلاني (٨٥١ ك. تا ٩٢٣ ك.) ئەڵێت: (قوله (إن يقدر الله علي)، أي: إن يضيق الله عليه، فهو قدر يقدر بمعنى ضيق عليه ومنه قوله تعالى: (ومن قُدِرَ عليه رزقه) أي: ضيق عليه)[١٢٤]. واته: (وتەی: (إن يقدر الله علي) واته: (إن يضيق الله عليه) واته: (خوای تعالى لەسەرمی توند بكات)، پێشەوا دەفەرموێت: ئەو (قدر)ە بە واتای (ضيق) دێت، وە وتەی خوا پەروەردگار: (ومن قُدِرَ عليه رزقه) واته: (ضيق)، واته لەسەرخۆی **توند** نەكات).

وە دەڵێت: (**وليس** ذلك شكا منه في قدرة الله على إحيائه)، واته: (ئەو پیاوە شک و گومانی نەبوو لەوەی خوای پەروەردگار توانای نییە زیندووی بكاتەوە).

٣) الحسيني خاوەنی پەرتووكی [مكمل إكمال الإكمال] لە ڕاقەی [صحيح مسلم]دا وتەی دوو پێشەوای (حافظ) دەگوازێتەوە، كە ئەوانیش (ابي عبدالله الأبي و پێشەوا المازي)یە كە دەڵێن: (وذلك أن الرجل لم يكن يَشَك في ثبوت القدرة الله تعالى ولا في كونه تعالى قادراً). واته: (ئەو پیاوە شک و گومانی نەبووە لە باڵادەستی و دەسەڵاتی خوای رب العالمين (ﷻ) بە شک و گومان نەبوو)[١٢٥].

٤) القرطبي (٦٠٠ بۆ ٦١٠ ك. تا ٦٧١ ك.) زۆر جوان باسی ئەوە دەكات كە ئەو پیاوە شک و گومانی نەبووە لە توانای خوای تعالى(ﷻ).

٥) وە هەروەها:

١) پێشەوای بەڕێز، دەریای زانست، ئامۆزا و هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشەوا عبداللەی كوڕی عباس (٣ پ.ك. تا ٦٨ ك.) (ﷻ) لێیان ڕازی بێت).

٢) عطاء (٢٧ ك. تا ١١٤ ك.).

٣) سعيد بن جبير (٤٤ ك. تا ٩٥ ك.).

٤) إبن جرير الطبري (٢٢٤ ك. تا ٣١٠ ك.).

---

(١٢٤) إرشاد الساري شرح صحيح بخاري - بەرگی: ١٠ - لاپەڕە: ٤٣٩.

(١٢٥) بەرگی: ٧ - لاپەڕە: ١٦٠.

٥) الثعلبي (١٢٦ تا ٤٢٧ ك.).
٦) إبن كثير (٧٠١ ك. تا ٧٧٤ ك.).
٧) الشوكاني (١١٧٣ ك. تا ١٢٥٥ ك.).
٨) فؤاد عبدالباقي (١٢٩٩ ك. تا ١٣٨٨ ك.).
وه جگه لەمانیش ئاوها دەڵێن[١٢٧].

---

(١٢٦) ڕاجیاوازی هەیە لەسەر لەدایک بوونی، بەڵام بە پێی بەڵگەکان لەدوای ساڵی ٣٨٠ی کۆچی لەدایک بووە، بڕوانە: [الکشف والبیان عن تفسیر القرآن للثعلبي - پێشەکی بەرگی: ١ - ناساندنی نووسەر - لاپەڕە: ٢٢]، والله أعلم بالصواب.

(١٢٧) کەواتە ئەو پیاوەی نەوەی ئیسرائیل بەگومان نەبووە لە توانای الله (ﷻ)، وەک وتمان ئەوانەی دەڵێن: (بە گومان بووە)، بە ڕووکاری فەرموودەکە بڕیار دەدەن وە تەنها بەو فەرموودەیەش بڕیاردەدەن، گەر فەرموودەکانی دیکە بهێنین بە ڕوون و ئاشکرایی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو پیاوە ئەهلی تەوحید بووە و گومانی نەبووە.

## گومانی سێیەم: فەرموودەی (ڕووداوی حەوارییەکان):

خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾[١٢٨]. واتە: (یادی ئەو کاتە بکەنەوە کاتێک حەوارییەکانی عیسا (ﷺ) وتیان: (ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئەرێ دەکرێ پەروەردگارت لە ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرێتە خوارەوە هەموو جۆرە خواردنێکی تێدابێت؟) پێغەمبەر عیسا (عليه السلام) فەرمووی: ئەی خەڵکینە لەخوای تعالی بترسن و واز لەو جۆرە قسانە بهێنن ئەگەر ڕاستە باوەڕتان بە دەسەڵاتی خوای رب العالمین هەیە (جل جلاله)).

**دەڵێن:** (حەوارییەکان گومانیان لە توانای خوای تعالی هەبووە لەوەی کە بتوانێت سفرەیەکی ئامادەکراویان لەخواردن بۆ بهێنێتە خوارەوە)!.

لە وەڵامدا **بە پشتیوانی الله دەڵێین:** (ئەگەر سەیرێکی ڕاڤەی سەلەف بکەین بۆ ئەم بابەتە، دەبینین زانایان دەڵێن حەوارییەکان شکیان نەبووە لە توانای خوای رب العالمین (جل جلاله) و پێچەوانەی ئەم وتەیە دواون).

ئەمەش ناوی ئەو ڕاڤەکارانەی قورئانن کە ئاوها دەڵێن:

١) پێشەوا علي بن أبي طالب (٢٣ پ. ک. تا ٤٠ ک.) (رضي الله عنه).
٢) دایکمان عائشة (١٩ پ.ک. تا ٥٨ ک.) (رضي الله عنها).
٣) سعيد بن جبير (٤٤ ک. تا ٩٥ ک.).
٤) مجاهد (٢١ ک. تا ١٠٤ ک.).
٥) حسن بصري (٢١ ک. تا ١١٠ ک.).
٦) السدي (و. ١٢٧ ک.).
٧) أحمد بن حنبل (١٦٤ ک. تا ٢٤١ ک.).
٨) ابو زکريا يحيى بن زياد الفراء (و. ٢٠٧ يان ٢١٥ ک.).
٩) ابن الأنباري المفسر (٢٧١ ک. تا ٣٢٨ ک.).
١٠) الفارسي المفسر (٢٨٨ ک. تا ٣٧٧ ک.).
١١) ابو جعفر ابن النحاس (و. ٣٣٨ ک.).

---

(١٢٨) المائدة : ١١٢.

١٢) البغوي (٤٣٣ يان ٤٣٦ ک. تا ٥١٦ ک.).
١٣) ابن عطية الغرناطي المفسر (٤٨١ ک. تا ٥٤١ ک.).
١٤) الواحدي المفسر(و. ٤٦٨ ک.).
١٥) ابن الجوزي البغدادي (٥١٠ ک. تا ٥٩٧ ک.).
١٦) ابن الحصار (و. ٦١٠ يان ٦١١ ک.).
١٧) ناصر الدين أحمد بن المنير المالكي (٦٢٠ ک. تا ٦٨٣ ک.).
١٨) أبو حيان الغرناطي المفسر (٦٥٤ ک. تا ٧٤٥ ک.).
١٩) الخازن المفسر (٦٧٨ ک. تا ٧٤١ ک.).
٢٠) النسفي (و. ٧٠١ ک.).
٢١) ابن جزي المالكي (٦٩٣ ک. تا ٧٤٠ ک.) صاحب (التسهيل).
٢٢) ابن كثير الديمشقي المفسر (٧٠١ ک. تا ٧٧٤ ک.).
٢٣) جلال الدين المحلي (٧٩١ ک. تا ٨٦٤ ک.).
٢٤) المحدث أبو زكريا الأنصاري (٨٢٤ ک. تا ٩٢٦ ک.).
٢٥) السيوطي (٨٤٩ ک. تا ٩١١ ک.).
٢٦) الخطيب الشربيني المفسر (و. ٩٧٧ ک.).
٢٧) الشهاب الخفاجي المفسر (و. ١٠٦٩ ک.).
٢٨) الصاوي (١١٧٥ ک. تا ١٢٤١ ک.) في حاشيته على الجلالين.
٢٩) سليمان بن عمر الحجيلي المفسر (و. ١٢٠٤ ک.).
٣٠) محمد رشيد رضا (١٢٨٢ ک. تا ١٣٥٤ ک.) صاحب (المنار).
٣١) جمال الدين القاسمي (١٢٨٣ ک. تا ١٣٣٢ ک.) خاوەنی (محاسن التأويل).
٣٢) الحلبي المفسر (و. ٧٥٦ ک.).
٣٣) محمد الطاهر بن عاشور (١٢٩٦ ک. تا ١٣٩٣ ک.) خاوەنی تفسير (التحرير التنوير).
٣٤) عبدالرحمن بن ناصر السعدي (١٣٠٧ ک. تا ١٣٧٦ ک.).
٣٥) خاوەنی پەرتووکی (التفسير الواضح) (١٣٣٢ ک. تا ١٣٩٢ ک.).
٣٦) المراغي (و. ١٣٧١ ک.) صاحب (تفسير المراغي).

ئەمانە زیاتر لە سی و پێنج ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز بوون لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەڵێن: (حەوارییەکان شکیان نەبوو)، إن شاء الله باسی هەندێکی دەکەین بۆتان بە ویستی اللَّهُ (ﷻ).

ئەم ئایەتە لەچەند ڕوویەکەوە لێکدراوەتەوە لای زانایان، لەوانە:

### ١/ ڕووی یەکەم:

حەوارییەکان وتیان: (هل تستطیع أن تسأل ربک). واتە: (تۆ دەتوانیت داوا لە پەروەردگارت بکەیت؟):

١) عن عائشة (١٩ پ.ک. تا ٥٨ ک.) (رضي الله عنها): (قالت: كان الحواريون لا يشكون أن الله يقدر على إنزال المائدة، ولكن قالوا: (هل تستطيع ربك))[١٢٩]، واتە: (لە دایکمان عائشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (حەوارییەکان شک و گومانیان نەبووە لە دەسەڵاتی خوای پەروەردگار (ﷻ) لە دابەزاندنی خوانێک، بەڵام وتیان: (هل تستطيع ربك) واتە: (دەتوانیت داوا لە پەروەردگارت بکەیت کە خوانێکمان بۆ دابەزێنێت).

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا فەرموویەتی: (كان الحواريون أعلم بالله مَن أن يقولوا: (هل يستطيع ربك؟) إنما قالوا: (هل تستطع ربك، أي: هل تستطيع أن تدعوه؟)[١٣٠]، واتە: (دایکمان عائیشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (حەوارییەکان زانابوون بە خوای تعالى بەوەی بڵێن: (خوای تعالى دەتوانێت؟) بەڵکوو وتیان: (دەتوانیت داوا لە پەروەردگارت بکەیت؟) واتە: ئایا تۆ دەتوانیت داوای لێ بکەیت).

٢) ابن ابي حاتم الرازي (٢٤٠ ک. تا ٣٢٧ ک.) پەرتووکەکەی لە عامر الشعبي (٢١ ک. تا ١٠٠ ک.) ئەویش لە علي (٢٣ پ. ک. تا ٤٠ ک.)ەوە (ﷺ)، کە فەرموویەتی: ((هل تستطيع ربك) قال: أي: علي بن أبي طالب (ﷺ): (هل يُعطيك ربك)[١٣١]، واتە: (هل تستطيع ربك) واتە: (هل يُعطيك ربك) واتە: (ئایا پەروەردگارت بەقسەت دەکات).

٣) هەروەها (أخرج أبو عُبيد و ابن جرير عن سعيد بن جبير أنه قرأها (هل تستطيع ربك وقال: (هل تستطيع أن تسأل ربك))، واتە: (سەعیدی کوڕی جوبەیر (٤٤ ک. تا ٩٥ ک.) ئەم پارچە ئایەتەی خوێندەوە: (هل تستطيع ربك) و فەرمووی: (هل تستطيع أن تسأل ربك) واتە: (ئایا دەتوانیت داوا لە پەروەردگارت بکەیت؟).

---

(١٢٩) القرطبي في تفسيره - بەرگی: ٨ - لاپەڕە: ٢٨٦.

(١٣٠) هەریەک لە پێشەوا ابن ابي شيبة و ابن جرير و ابن المنذر و ابن ابي حاتم و ابن مردوية لە دایکمان عائیشەوە (رضي الله عنها) ئەو وتەیە دەگوازنەوە.

(١٣١) الدر المنثور في تفسير بالمأثور - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ٣٤٦.

٤) به خوێندنەوەی الكسائي (١١٩ ک. تا ١٨٩ ک.) ئەو وشەیە بە (تستطيع) دەخوێندرێتەوە، خۆ گەر بەو شێوەی کە لە قورئاند جێگیر بووە بیخوێنێرێتەوە، واتە بڵێین (هَلْ يَسْتَطِيعُ) بەواتەی ئەوە دێت کە: (ئایا خوای رب العالمين وەڵامی داواکاریەکەت دەداتەوە و خوای رب العالمين بەقسەمان دەکات؟)، ئەمە طبري وای فەرمووە.

٥) طبري (٢٢٤ ک. تا ٣١٠ ک.) دەڵێت: (كان الحواريون لا يشكون أن الله قادر أن يُنَزل عليهم مائدة، ولكن قالوا: يا عيسى هل تستطيع ربك)[132]، واتە: (حەوارییەکان گومانیان نەبوو لەوەی کە بێگومان خوای پەروەردگار (ﷻ) توانای دابەزاندنی سفرەیەکی ئامادەکراوی هەیە، بەڵکو گوتیان: ئەی پێغەمبەر عیسا (ﷺ) تۆ دەتوانیت ئەو داوایە لە پەروەردگارت بکەیت؟).

٦) پاشانیش داواکارییەکەیان لە گومان و شکیان نەبووە بەرامبەر توانای خوای پەروەردگار (ﷻ)، بەڵکو لە نەرمی داواکردن و ئەدەبیان بووە بەرامبەر خوای پەروەردگار و بەم شێوەیە داوایان کردووە.

پێچواندن نەبێت وەک یەکێک بە یەکێکی تر بڵێ: (ئایا فلان کەس دەتوانێت بێت و قسەمان بۆ بکات؟) لە کاتێکدا دەشزانێت کە ئەو کەسە هەم توانای هاتنی هەیە هەم قسەکردنەکەش، بەواتای ئەوە دێت: ئایا ئەوەمان بۆ دەکات؟ ئایا وەڵامی داواکاریەکەمان دەداتەوە؟ حەوارییەکان ئەهلی باوەڕ و دڵنیایی و تەوحید بوون، نەزانین بە تەوحید و سیفەتی توانایی خوای تعالی (ﷻ) هەرگیز لەگەڵ شان و شکۆ و پێگەی ئەواندا ناگونجێت.

## ٢/ ڕووی دووەم:

(پرسیاری حەوارییەکان بۆ دڵئارامی و زیادبوونی باوەڕیان بوو) :

هەندێکی تر وەک بەیضاوی (و. ٦٨٥ یان ٦٩١ ک.) و قورطوبی (٦٠٠ بۆ ٦١٠ ک. تا ٦٧١ ک.) و ئالوسی (١٢١٧ ک. تا ١٢٧٠ ک.) و ابن عاشور (١٢٩٦ ک. تا ١٣٩٣ ک.)

(١٣٢) جامع البيان - بەرگی: ٩ - لاپەڕە: ١١٨.

وتوويانه: (پرسیاری حەوارییەکان بۆ دڵئارامی و زیادبوونی باوەڕیان بوو، وەک داواکارییەکەی پێغەمبەر ابراهیم (عليه السلام))[١٣٣].

کۆتا وتە لەسەر ئەم بابەتە، ئەوەیە دەڵێین: (أن للطبري مذهباً معروفاً نقله عنه الأئمة الثقات وهو تكفير جاهل الصفة، وعدم إعذاره بالجهالة، فكيف يُقال: أنه قد عذر الحواريون بالجهل؟ والصفة الذي شكوا فيها هي القُدرة، والإمام الطبري يُكفر جاهل الصفة مُطلَقاً وقد نقل عنه هذها المذهب الإمام النووي في شرح السنة: وقالت طائفة: هذا الرجل جهل صفة من صفات الله تعالى، وقد اختلف العلماء في تكفير جاهل الصفة، قال القاضي: وممن كفره بذلك: ابن جرير الطبري... إلخ)[١٣٤]، واتە: (طبري ڕێبازێکی ناسراوی هەیە، کە هەندێ لە پێشەوا جێی متمانەکان لێیانەوە گواستووەتەوە، ئەویش ئەوەیە تەکفیری (جاهل الصفة) واتە نەزان بە سیفەتێک دەکات[١٣٥]، وە پۆزشت بە نەزانینی بۆ ناهێنێتەوە، چۆن ئەوترێت ئەو پێشەوایە پۆزشتی داوە بە حەوارییەکان بە نەزانین؟، وە ئەو سیفەتەی کە گوایە ئەوان شکیان هەبوو تێیدا، سیفەتی توانا و هێز بووە، وە طبري تەکفیری نەزان بە سەفەتێک دەکات بە ڕەهائی (واتە: (مطلق)ی)، وە نەوەوی لە [شرح مسلم]دا ڕێبازەکەی ئەوی گواستۆتەوە و دەفەرموێت: (دەستەیەک دەڵێن: ئەو پیاوە نەزان بووە بە سیفەتێکی خوای رب العالمین، وە زانایان ڕا جوداییان هەیە لە کافرکردنی (جاهل الصفة)، قاضي عياض (٤٧٦ ک. تا ٥٤٤ ک.) دەڵێت: (وە ئەو پێشەوایانەی کە تەکفیری (جاهل الصفة)یان کردووە، پێشەوا طبري یەک لەوانە)[١٣٦].

(١٣٣) بۆ درێژەنەدان بە باسەکە وتەی ئەو زانایانەی ڕاڤەی قورئان ناهێنم.
(١٣٤) شرح مسلم - بەرگی: ١٧ - لاپەڕە: ٧١.
(١٣٥) واتە کەسێک نەزان بێت بە سیفەتێکی خوای رب العالمين لای طبري کافرە.
(١٣٦) الشفاء في تعريف حقوق المصطفى - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ٢٧٨.

## گومانی چوارەم: کڕنووش بردنەکەی معاذ بن جبل (رضي الله عنه):

ابن ماجة (٢٠٩ ک. تا ٢٧٣ ک.) لە [سنن]ەکەیدا فەرموودەیەکی هێناوە کە بەم شێوەیەیە ڕشتەی فەرموودەکە: (حدثنا أزهر بن مروان، ثنا[١٣٧] حمادُ بن زيد، عن أيوب، عن **القاسم الشيباني**، عن عبدالله بن أبي أوفي: لما قدم معاذ من الشام سجد للنبي (ﷺ). قال: (ماهذا يامعاذ؟) قال: أتيتُ **الشام** فوافقتُهُم يسجدون لأسَاقِفَّتِهِم وَبَّطارِقَتِهِم. فَوَدِدتُ في نفسي أن نَفعَلَ ذلك بك. فقال رسول الله (ﷺ): )فلا تفعلوا. فإني لو كنتُ آمراً أحَداً أن يَسجُدَ لغير الله، لَأَمَرتُ المَرأَتُ أن تَسجُدَ لِزَوجِها...)»[١٣٨] إلخ الحديث، (ئەوەندەی فەرموودەکە باسی ئێمەیە). واتە: (أزهر بن مروان بۆی گێڕاینەوە و فەرمووی حماد بن زيد بۆی گێڕاینەوە لە أيوب ەوە لە **القاسم الشيباني** ەوە لە عبدالله بن أبي أوفي ەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە موعاذی کوڕی جەبەل (١٨ پ.ک. تا ١٨ ک.) لە **شام** گەڕایەوە کڕنووشێکی برد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: (ئەمە چیە ئەی موعاذ؟). ئەویش فەرمووی: (لە شام بینیم خەڵکی کڕنووشیان دەبرد بۆ گەورە و پیاوماقوڵانیان، بۆیە ئەم کارەم ئەنجامدا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەم کارە ئەنجام مەدە، ئەگەر فەرمانم بکردایە کە کڕنووش ببرێت بۆ جگە خوای رب العالمين (جل جلاله)، ئەوا فەرمانم دەدا بە ئافرەت کڕنووش بەرێت بۆ مێردەکەی...) تا کۆتایی فەرموودەکە.

**دەڵێن:** (موعاذی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه)، کڕنووشی بردووە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لە کاتێکدا کڕنووش بردن بۆ جگە خوای رب العالمين کوفرە کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەکفیری نەکرد، چونکە موعاذی کوڕی جەبەل **عوزری هەبوو بە جەهل**)!.

لە وەڵامدا **بە پشتیوانی** الله **دەڵێین:** (ئەم فەرموودەیە لاوازیی هەیە لە ڕشتە و دەقەکەشیدا)، بەم شێوەیە:

**١/ ڕشتەکەی:**

---

(١٣٧) (سوودێکی زانستی فەرموودە).
(ثنا) دەخوێندرێتەوە بە (حدثنا)، واتە: بۆی گێڕاینەوە. خوێنەر پێویستە بڵێت: (حدثنا = حەددەثەنا) نەک بڵێ: (ثنا = ثەنا)!، وە پێش ئەوەی بڵێ (حدثنا) پێویستە بڵێ: (قال = قالە). کەواتە پێویستە خوێنەر بڵێت: (قال: حدثنا حماد بن زيد) واتە: (ئەزهەری کوڕی مەروان فەرموی: حەممادی کوڕی زەید بۆی گێڕاینەوە)، والله أعلم بالصواب.

(١٣٨) سنن إبن ماجة - صفحة: ٥٩٥ - كتاب: النكاح - باب: الرابع: حق الزوج على المرأ - رقم حديث: ١٨٥٣.

لە ڕشتەی فەرموودەکەدا گێڕەرەوەیەک هەیە بە ناوی (قاسِمُ بنُ عَوف الشيباني) وەک ئاماژەمان پێداوە لە ڕشتەی فەرموودەکەدا، ئەم پیاوە لاوازە و زانایان قسەیان لەسەر کردووە، وە ئەم فەرموودەیە تەنها ئەمیش وتوویەتی: (موعاذی کوڕی جەبەل کڕنووشی بردووە)!.

موسڵمانانی بەڕێز، ئەمەش ڕای زانایانە لەسەر ئەم پیاوە:

١) ڕای شعبة بن حجاج (٨٥ ک. تا ١٦٠ ک.) ئاوهایە: (ضعفه وتركه ولم يرو عنه).
٢) ابو حاتم الرازي (١٩٥ ک. تا ٢٧٧ ک.) دەڵێت: (مضطرب[١٣٩] الحديث).
٣) النسائي (٢١٥ ک. تا ٣٠٣ ک.) دەڵێت: (ضعيف الحديث).
٤) الذهبي (٦٧٣ ک. تا ٧٤٨ ک.) دەڵێت: (مختلف في حاله).
٥) خاوەنی پەرتووکی [تحرير تقريب التهذيب] کە (إبن حجر)ە (٧٧٣ ک. تا ٨٥٢ ک.) دەڵێت: (ضعيف، يعتبر به في المتابعات والشواهد[١٤٠]).

### ٢/ دەقەکەی:

(١٣٩) سەبارەت بە فەرموودەی: (مضطرب - شڵەقاو):
١) پرسیار: (مضطرب) واتە چی؟
وەڵام: واتە: شڵەقاو.
٢) پرسیار: پێناسەکەی چییە؟
وەڵام: ئەو فەرمودەیەیە کە بگێڕدرێتەوە بە چەند شێوەیەکی ناقۆڵا، بەجۆرێک کە کۆک کردن (التوفيق) نەکرێت لە نێوانیان.
٣) پرسیار: چەند جۆری هەیە؟
وەڵام: دوو جۆر فەرموودەی (مضطرب) هەیە: (مضطرب السند ، مضطرب المتن).
٤) پرسیار: (مضطرب) جۆرێکە لە فەرمودەی لاواز یان دروست؟ وە گەر لاوازە هۆکارەکەی چییە؟
وەڵام: فەرموودەی (مضطرب) جۆرێکی فەرموودەی لاوازە، وە هۆکاری لاوازیەکەی ئەوەیە کە بەو شڵەقان و (إضطراب)ە هەست دەکرێ کە ئەو گێڕەرەوانە توانەی لەبەرکردنیان نەبووە. (لەبەرکردن (ضبط) مەرجێکی فەرموودەی دروستە).
٥) پرسیار: چ پەرتووکێک باشە بۆ شارەزابوون لەم بابەتە؟
وەڵام: پەرتووکی [المقترب في بيان المضطرب – دانراوی: شێخ إبن حجر العسقلاني]، والله أعلم بالصواب. بڕوانە: [تيسير مصطلح الحديث - دکتۆر محمود طحان - لاپەڕە: ١٤١].

(١٤٠) واتە: (لاوازە ئەو کەسە و بایەخی بۆ دادەنرێ بە موتابەعە و شەواهید).

جگە لە ڕشتەکەی، ئەم فەرموودەیە لە دەقەکەشیدا نەخۆشیی[١٤١] هەیە، کە تێیدا باسی ئەوە دەکات موعاذ (ﷺ) لێی ڕازی بێت) چووە بۆ **شام** لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)!، لە کاتێکدا لە سەردەمی پێشەوا عومەردا گەشتی کردووە بۆ شام (ﷺ) لێی ڕازی بێت)، جگە لەم ڕێگەیەش بە ڕێگایەکی جیاواز لە [مسند]ی أحمد یش هاتووە کە دەگێڕێتەوە (أبي ظبيان) (و. ٨٩ یان ٩٠ ک.) لە موعاذەوە دەگێڕێتەوە، کە کاتێک موعاذی کوڕی جەبەل (ﷺ) لە **یەمەن** دەگەڕێتەوە دەفەرمویێت: (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوانێکم بینی لە یەمەن هەندێکیان کڕنووشیان بۆ هەندێکیان دەبرد، ئایا کڕنووش بەرین بۆ تۆ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر فەرمانم بکردایە کەسێک کڕنووش بۆ کەسێک بەرێت ئەوا فەرمانم دەکرد کە ئافرەت کڕنووش بۆ پیاوەکەی بەرێت). ئەم فەرموودەیەش لەڕوی ڕشتەوە دیسان لاوازە و لەجۆری فەرموودەی پچڕاو و (منقطع[١٤٢])ە، وەک پێشەوای (علل)ی فەرموودە الدارقطني (٣٠٦ ک. تا ٣٨٥ ک.) دەڵێت: (وأبو ظبيان لم يسمع من معاذ)[١٤٣]، واتە: (أبو ظبیان لە موعاذی کوڕی جەبەلی نەبیستووە).

---

(١٤١) واتە: (علة)، بۆ شارەزابوون لە زانینی نەخۆشیی و لاوازیی لە دەقی فەرموودەدا، بگەڕێرەوە بۆ پەرتووکی: [تيسير مصطلح الحديث - لاپەڕە: ١٢٥].

(١٤٢) سەبارەت بە فەرموودەی: (منقطع - پچڕاو):

١) پرسیار: منقطع واتە چی؟
وەڵام: واتە: پچڕاو.

٢) پرسیار: پێناسەکەی چییە؟
وەڵام: ئەو فەرمودەیەیە کە لە ڕشتەکەیدا پچڕان هەیە، جا یەکسانە پچڕانەکە بە هەرجۆرێک بێت. ئەمە لای زانایانی کۆن (سلف)، بەڵام زانایانی دواتر (خلف) دەفەرموون: ((منقطع) شێوازێکی سەربەخۆیە. ئەمەش بۆیە وا دەفەرموون، چونکە هەرسێ شێوازی (مُرسَل ، مُعَلق ، مُعضَل) هەر پچڕانن وە هەریەکەیان لە شوێنێکی ڕشتەکەدا، ئەم دابەشکردنە لای زانایانی دواترین دروستبووە، والله أعلم بالصواب، بۆ زیاتر بڕوانە: [النخبة الفكر و شرحها - لابن حجر العسقلاني - لاپەڕە: ٤٤].

٣) پرسیار: حوکمەکەی چییە؟
وەڵام: لاوازە بە ڕێککەوتنی نێوان زانایان، ئەمەش لەبەر بێ ئاگایی بوون بە حاڵی گێڕەرەوەکە کە باس نەکراوەکە لە ڕشتەکە، (بۆ نموونە: أحمد بڵێت: گوێم لە پێشەوا ابن مسعود بوو (ﷺ) وای فەرموو)!، لە کاتێکدا أحمد نەگەشتووە بە پێشەوا ابن مسعود (ﷺ))، بڕوانە: [تيسير مصطلح الحديث - لاپەڕە: ٩٤].

(١٤٣) علل الدارقطني - بەرگی: ٢ - لاپەڕە: ٤١٤.

جگە لەمەش دەقی ئەم فەرموودەیەی أحمد (١٦٤ ک. تا ٢٤١ ک.) نەخۆشیی و لاوازیی تێدایە، چونکە جێگیر نەبووە کە موعاذی کوڕی جەبەل (ﷺ) گەشتی یەمەن بکات، تەنها لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبێت کە ناردی بۆ یەمەن، و کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو ئەو لە یەمەن بوو. وە لەسەردەمی پێشەوا أبو بكر صديق (ﷺ) گەڕایەوە.

پاشان چۆن ئەقڵی سەلامەت و دروست ملکەچی ئەوە دەبێت، موعاذێک کە لە گەورە زانایانی هاوەڵان و زاناترینی کەس بە ڕەوا و قەدەغە[١٤٤] نەزانێت کە کڕنووش بردن بۆ جگە خوای پەروەردگار (ﷻ) کوفرە و کڕنووش بەرێت بۆ پێغەمبەری خوا؟!، وە پێی بڵێیت: (نەزان بووە) پەنا دەگرین بە خوای پەروەردگار (ﷻ). گریمان فەرموودەکەش ڕاستە و لاواز نییە، هێشتاش نابێتە بەڵگە بۆ پۆزشت بە نەزانین و نابێتە بەڵگە بۆ ئەم بابەتە، چونکە ئەو کڕنووش بردنەی پێشەوا موعاذ (ﷲ (ﷻ) لێی ڕازی بێت) (گەر ڕاستیش بێت، کە لە ڕاستیدا ڕاست نییە) کڕنووشبردنی پەرستش نەبووە، بەڵکو کڕنووشی ڕێز بووە، ئەوەش ئاشکرایە کە لە پێش ئیسلامدا کڕنووشی ڕێز براوە بۆ پیاوماقوڵ و زاناکان، دواتر ئەمە قەدەغە کرا، وە ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێ کرد وە کڕنووشیش لە دینی ئیسلامدا بۆ جگە ﷲ (ﷻ) قەدەغەیە و تاوانە و گوناهە، لانی کەمی قەدەغە و لانی زۆری کوفرە پەنا بە ﷲ (ﷻ).

---

(١٤٤) سوودێکی فەرهەنگیی:

١) ڕەوا: (حلال، کە (دروست ، گونجاو ، شیاو)یشی پێ دەگوترێت.

٢) قەدەغە: (حرام، کە (یاساغ ، نەگونجاو ، نەشیاو)یشی پێ دەگوترێت.

## گومانی پێنجەم/ فەرموودەی (ذات أنواط):

قال أبو عيسى ترمذي (٢٠٩ ک. تا ٢٧٩ ک.): (حدثنا سعيد بن عبدالرحمن المخزومي، حدثنا سفيان، عن الزهري، عن **سنان بن أبي سنان**، عن أبي واقد الليثي: أن رسول الله (ﷺ) لما خرج إلى حنين مر بشجرة للمشركين، يقال لها: ذاتُ أنواطٍ يُعَلقون عليها أسلحتهم، فقالوا: يا رسول الله، اجعل لنا ذاتَ أنواطٍ كما لهم ذاتُ أنواطٍ، فقال النبي (ﷺ): (سبحان الله، هذا كما قال قوم موسى: اجعل لنا إلها كما لهم آلهة، والذي نفسي بيده، لتركَبُن سُنةً مَن كان قبلكم)[١٤٥]. واتە: (**لەگەڵ پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **بەرەو حونەین ڕۆشتین**[١٤٦]، وە بەلای دارێکدا ڕۆشتین کە پێی دەگوترا: (ذات أنواط) واتە: **خاوەن چڵ و پۆپەکە**، وە ئەهلی شیرک چەک و شمشێرەکانیان پێدا هەڵواسی و لەپەنایدا دەمانەوە بۆ پیرۆزیی[١٤٧]، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): تۆش دارێکی وەک ئەوەمان بۆ دابنێ، پێغەمبەی خوا (ﷺ) فەرمووی: (پاکی و بێ گەردی بۆ الله (ﷻ) بەڕاستی ئەوەتان وت کە نەوە **ئیسرائیل** بە موسای وت (ﷺ)، کە وتیان: (اجعل لنا إلها كما لهم آلهة) بێگومان ئێوە شوێن ڕێچکەی گەلانی پێش خۆتان دەکەون).

ئەمە فەرموودەکە بوو کە ترمذي (٢٠٩ ک. تا ٢٧٩ ک.) لە [جامع]ەکەی وە أحمد (١٦٤ ک. تا ٢٤١ ک.) لە [مسند]ەکەی وە عبدالرزاق (١٢٦ ک. تا ٢١١ ک.) لە [مصنف]ەکەی هێناویانە.

**دەڵێن**: (هاوەڵان داوای شیرکیان کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەچی تەکفیریشی نەکردن و پۆزشت بە نەزانینی بۆ دانان).

لە وەڵامدا **بە پشتیوانی** الله **دەڵێین**: (ئەم فەرموودە بە هیچ جۆرێک نابێتە بەڵگە بۆ بابەتی پۆزشت بە نەزانین) گەر دەپرسی چۆن؟ ئەوا لە وەڵامتدا دەڵێم: ئەم فەرموودە لە هەموو پەرتووکەکانی فەرموودە بە دوو ڕێگا هاتووە، واتە: لە دوو

---

(١٤٥) رواه ترمذي في [كتاب: الفتن - باب: ما جاء لتركَبُن سُنَنَ من قبلكم - رقم حديث: ٢١٨٠ - صفحة: ٨١٩].

(١٤٦) لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: (ئێمە تازە موسڵمانبوو بووین).

(١٤٧) پیرۆزیی واتە: (بركة).

کەسەوە هاتووە ئەوانیش: (سنان بن أبي سنان ، کثير بن عبدالله). جا ئەم دوو کەسە لاوازن، بەویستی ﷲ (ﷻ) ڕای زانایان باس دەکەین لەسەریان، سەرەتا گەر باسێکی ئەم فەرموودەی پێشەوا ترمذي بکەین (بەڕەحمەت بێت)، دەڵێین: دیسان لە ڕشتە و گۆدا لاوازیی هەیە:

١/ فەرموودەکەی (سنان بن أبي سنان):

١) ڕشتە: لەسەر ڕشتەی ئەم فەرموودەی (سنان بن أبي سنان)، ڕای زانایان بەم چەشنەیە:

١) بوخاری (١٩٤ ک. تا ٢٥٦ ک.) ڕاستەوخۆ پشتی بە فەرموودەی سینان نەبەستوە، بەڵکو داوێتیە پاڵ (أبي سلمة) وە زانراوە لای زانایانی فەرموودە کە (أن البخاري إذا ذكر رجلا مقرونا مع ثقة فهذا دليل على **ضعفه** لأنه لم يعتمده إستقلالا). واتە: (بوخاری گەر گێڕەرەوەیەکی هێنابێ لەگەڵ متمانەپێکراوێکدا ئەوا بەڵگەیە لەسەر **لاوازی ئەو گێڕەرەوەیە** و پشتی پێ نەبەستووە)، وە لە بنەڕەتدا سنان بن أبي سنان **(مجهول حال)**ە.

٢) موسلیمیش (٢٠٦ ک. تا ٢٦١ ک.) بەهەمان شێوە ڕاستەوخۆ پشتی پێ نەبەستووە بەڵکو لە ڕێگەی (متابعات) و (شواهيد)ەوە فەرموودەی سنان بن أبي سنان ی هێناوە.

٣) **العقيلي** (و. ٣٢٢ ک.) دەڵێت: **(مجهول)**.

٤) **علي بن عراق** (٩٠٧ ک. تا ٩٦٣ ک.) **خاوەنی پەرتووکی [تنزية الشريعة]** لە باسی فەرموودەی (من كانت في بيته شاة كان في بيته بركة). دەڵێت: (هو من حديث أبي هريرة فيه عمر بن داود عن سنان بن أبي سنان وهما **مجهولان**).

٥) **المناوي** (٩٥٢ ک. تا ١٠٣١ ک.) دەفەرموێ: لەسەر فەرموودەی (السواك يزيد الرجل الفصاحة) دەڵێت: (قال ابن الجوزي: (حديث لا أصل له، وعمر وسنان، قال العقيلي: (مجهولان، والحديث منكر غير محفوظ)[١٤٨].

(١٤٨) فيض القدير شرح الجامع الصغير من أحاديث البشير النذير - صفحة: ١٤٩.

٢) دەق: دەقی ئەم فەرموودە کە (سنان بن أبي سنان)ی تێدایە، تێیدا هاوەڵی بەڕێز أبي واقد الليثي (و. ٦٨ ک. یان ٦٥ ک.) (ﷺ) دەفەرموێ: (نحن حدثاء عهد بكفر) وەک لە جگە پێشەوا ترمذي (٢٠٩ ک. تا ٢٧٩ ک.)، پێشەوا أحمد (١٦٤ ک. تا ٢٤١ ک.) و پێشەوا أبو داود الطيالسي (١٣٣ ک. تا ٢٠٤ ک.) (بەڕەحمەت بن) هێناویانە، بە واتای: (ئێمە لە کوفرەوە نزیک بووین، واتە ئێمە تازە موسڵمانبوو بووین)[149].

٢/ فەرموودەکەی (كثير بن عبدالله):

١) ڕشتە: لەسەر ئەم فەرموودەی (كثير بن عبدالله)، ڕای زانایان بەم چەشنەیە:

١) شافیعی (١٥٠ ک. تا ٢٠٤ ک.) دەڵێت: (ذاك **أحد الكذابين** أو **أحد أركان الكذب**).

٢) علي ابن المديني (١٦١ ک. تا ٢٣٤ ک.) دەڵێت: **(ضعيف)**.

٣) أحمد (١٦٤ ک. تا ٢٤١ ک.) دەڵێت: (**منكر**[150] الحديث ليس بشيء).

٤) ابو حاتم الرازي (١٩٥ ک. تا ٢٧٧ ک.) دەڵێت: **(ليس بالمتين)**.

٥) أبي داود (٢٠٢ ک. تا ٢٧٥ ک.) دەڵێت: (كان **أحد الكذابين**).

٦) أبو زرعة الرازي (٢١٠ ک. تا ٢٦٤ ک.) دەڵێت: **(ليس بقوي)**.

---

(١٤٩) گەر بیری بێت ئێمە لە ﷺ وکە وتمان لای زانایانی ئەهلی سوننە کەسی (حديث عهد بالإسلام) **بەخشراوە**.

(١٥٠) سەبارەت بە فەرموودەی (منكر - نەناسراو):

١) پرسیار: منكر واتە چی؟
واتە: فەرموودەی نەناسراو.

٢) پرسیار: پێناسەکەی چیە؟
وەڵام: زانایان چەند پێناسەیەکیان بۆ کردووە، لەوانە: (ئەو فەرموودەیە کە کەسێکی لاواز ڕیوایەتی کردووە و دژایەتی هەیە لەگەڵ کەسێکی متمانەپێکراو).

٣) پرسیار: جیاوازی منكر و شاذ چییە و حوکمیان چییە؟
وەڵام: **فەرموودەی منكر**: فەرموودەی **گێڕەرەوەیەکی لاواز** دژی فەرموودەی گێڕەرەوەیەکی متمانەپێکراوە، وە **فەرموودەی شاذ**: فەرموودەی **گێڕەرەوەیەکی متمانەپێکراو** دژی فەرموودەی گێڕەرەوەیەکی **لە خۆی متمانەپێکراوترە**. وە **هەردووکیان لاوازن**، والله أعلم بالصواب، بڕوانە: [مصطلح الحديث ی دکتۆر محمود طحان - لاپەڕە: ١١٩].

٧) عبداللەی کوڕی پێشەوا أحمد (٢١٣ ک. تا ٢٩٠ ک.) دەڵێت: **(ضرب على حديث كثير بن عبدالله في المسند ولم يحدثنا عليه)**.

٨) النسائي (٢١٥ ک. تا ٣٠٣ ک.) دەڵێت: **(متروك)** لە جێیەکی دیکە: **(ليس بثقة)**.

٩) أبو حاتم بن حبان البستي (٢٧٠ ک. تا ٣٥٤ ک.) دەڵێت: **(منكر الحديث جدا)**.

١٠) الدراقطني (٣٠٦ ک. ٣٨٥ ک.) دەڵێت: **(متروك**[١٥١]**)**.

١١) زكريا بن يحيى الساجي (و. ٣٠٧ ک.): **(ضعفه)**.

١٢) أبو نعيم الأصبهاني (٣٣٦ ک. تا ٤٣٠ ک.): **(ضعفه)**.

١٣) ابن عبد البر الأندلسي (٣٦٨ ک. تا ٤٦٣ ک.) دەفەرموێت: **(مُجمَعٌ على ضعفه)! کۆ دەنگیی هەیە لەسەر لاوازیی ئەم گێڕەرەوەیە.**

١٤) ابن حجر (٧٧٣ ک. تا ٨٥٢ ک.) دەڵێت: **(ضعيف)**.

١٥) خاوەنی پەرتووکی [تحرير تقريب التهذيب] کە (ابن حجر)ە دەڵێت: **(متروك الحديث)**.

ئەوەندە بەسە، والله أعلم بالصواب.

٢) دەق: لە دەقی ئەم فەرموودەیەی (عبدالله بن كثير)، هاوەڵی بەڕێز أبي واقد الليثي (ﷺ) دەفەرموێت: (نحن حدثاء عهد بكفر)، واتە: (ئێمە لە کوفرەوە نزیک بووین (واتە: تازە موسڵمانبوو بووین)) لە کاتێکدا ڕا جیاوازییەکی

---

(١٥١) سەبارەت بە فەرمووودەی (متروک - وازلێهێنراو):

١) پرسیار متروک واتە چی؟
واتە: وازلێهێنراو.

٢) پرسیار: پێناسەکەی چیە؟
وەڵام: ئەو فەرموودەیە کە لە ڕشتەکەیدا گێڕەرەوەیەک هەیە تۆمەتبار کراوە بە درۆکردن.

٣) پرسیار: حوکمەکەی لەگەڵ پلەی لاوازییەکەی چییە؟
وەڵام: فەرموودەیەکی لاوازە، وە لە دوای فەرموودەی (موضوع - هەڵبەستراو) (جا (موضوع) هەر وەرناگیرێ، بۆیە لە ڕیزی لاواز نییە، بەڵکو بە سەربەخۆیی جۆرێکی تری فەرموودەی وەرنەگیراوە (مردود)) بە لاوازترین جۆری فەرموودە دادەنرێ، لە دوای ئەمیش (منكر - وازلێهێنراو)، پاشان (**معلل** - عەیبدار)، پاشان (مدرج - (لە ڕووی واتاوە واتە:) پلە پلە (لە ڕووی زانستی فەرموودەوە واتە:) زیادەی ناو ڕشتە یان دەق)، پاشان (مقلوب - وەرگەڕاو)، پاشان (مضطرب - شڵەقاو) بڕوانە: [مصطلح الحديث: لاپەڕە: ١١٧].

زۆر هەیە لەسەر ئەوەی: (ئایا ئەو هاوەڵە نازدارە جەنگی بەدری بینیوە؟ یان نا!)، ڕای زانایان بەم چەشنەیە لەسەری:

١) ئەو زانایانەی دەڵێن بەدری مەزنی **بینیوە** ئەمانەن:
   ١) بخاري (١٩٤ ک. تا ٢٥٦ ک.).
   ٢) ابن حبان (٢٧٠ ک. تا ٣٥٤ ک.).
   ٣) أبو أحمد الحاكم (٢٨٥ ک. تا ٣٧٨ ک.).
   ٤) الباوردي لە [الصحابة].
   وە جگە ئەمانیش.

٢) ئەو زانایانەی دەڵێن بەدری مەزنی **نەبینیوە** ئەمانەن:
   ١) ابن سعد (١٦٨ ک. تا ٢٣٠ ک.).
   ٢) ابن عبد البر (٣٦٨ ک. تا ٤٦٣ ک.)دەڵێت: ((قیل: شهد بدرا))، واتە: (دەگوترێ: بەدری بینیوە).
   ٣) المزي (٦٥٤ ک. تا ٧٤٢ ک.) دەڵێت: (لە بینی بەدریدا تێڕوانین هەیە).
   ٤) لە وەڵامی ابن عبد البر دا، الذهبي (٦٧٣ ک. تا ٧٤٨ ک.) لە [تجريد أسماء الصحابة]دا ئەڵێ: (ليس بشيء) واتە: (بەو شێوەیە نییە).
   وە جگە ئەمانیش.

لە کۆتاییدا **بە پشتیوانی** ﷻ **دەڵێین:** ئەم فەرموودەیە هەرچۆنێک بیگریت نابێتە بەڵگە بۆ پۆزشت بە نەزانین، گەر بکۆڵیتەوە لە ڕشتەکەی دوو کەس لە هاوەڵی بەڕێز أبي واقد الليثي یان گێڕاوەتەوە (﵁)، ئەوانیش: (سنان بن أبي سنان ، كثير بن عبدالله) هەردووکیان قسەی زۆریان لەسەرە، تەنانەت قسە لەسەر أبي واقد الليثي یش هەیە (﵁) بەڵام لەڕووی لاوازییەوە نا، بەڵکو لە ڕووی ئەوەی کە بەدری بینیوە یان نا!. گەر بەدری بینیبێ ئەوە دەقی فەرموودەکە لاوازیی تێدەکەوێت، بەوەی ئەڵێت: (نحن حدثاء عهد بكفر)، گەر ڕشتە ڕاست بوو وە أبي واقد یش بەدری نەبینیبوو وە هیچ کێشەش نەبوو لە فەرموودەکە، هێشتاش نابێتە بەڵگە بۆ ئەم بابەتە، چونکە دەفەرموێ: (نحن حدثاء عهد بكفر) ئەمەش

وەک دووباره و سێ باره وتمان و دەیڵێینەوە: (لای زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت **دەبێتە پۆزشت** بۆیان). وە گەر سەیری فەرموودەکە بکەین جارێکی تر دەبینین وەک موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب (١١١٥ ک. تا ١٢٠٦ ک.) دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) پۆزشتی پێ نەدان و توڕەبوو، وە لە گێڕانەوەیەکدا (الله أکبر)ی فەرمووە، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا (سبحان الله)ی فەرمووە).

دواتریش ئەم فەرموودە ئەوەی تێدا دەردەکەوێ کە هاوەڵان (الله (جل جلاله)) لێیان ڕازی بێت) هەموویان ئەو داوایەیان نەکرد، بەڵکو کۆمەڵێکی کەم ئەم (**داوا**)یەیان کرد، وە هەروەها تەنها (**داوا**)یان کرد، ئەنجامیان نەدا!، گەر ئەنجامیان بدایە کوفریان دەکرد (پەنا دەگرین بە الله (جل جلاله))، هاوەڵان بەریین لەوەی کوفر بکەن).

وە عبدالعزیز بن عبدالله ابن باز (١٣٣٠ ک. تا ١٤٢٠ ک.) دەڵێت: (أما الذين طلبوا من النبي (ﷺ) أن يجعل لهم ذاتُ أنواطٍ يعلقون بها أسلحتهم فهؤلاء كانوا حديثي عهد بكفر، وقد **طلبوا** فقد **ولم يفعلوا** فكان ما حصل منهم مخالفاً للشرع، وقد أجابهم النبي (ﷺ) بما يدل على أنهم لو فعلوا ما طلبوا كفروا)[١٥٢]، واتە: (هەرچی ئەوانە واتە ئەو هاوەڵانە هەیە کە داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە (ذات أنواط)ێکیان بۆ دابنێ و چەکەکانیانی پێدا هەڵواسن، ئائەوانە کەسانێک بوون نزیک بوون لە کوفر (واتە: تازە موسڵمانبوو بوون) ئەو هاوەڵانە تەنها **داوایان کرد** و **ئەنجامیان نەدا** تا پێچەوانەی شەرع بێت، وە لە وەڵامدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەها وەڵامی دانەوە کە ئەگەر بێتو ئەنجامی بدەن کافر دەبن (پەنا دەگرین بە الله (جل جلاله))).

وە صالح الفوزان (١٣٥٤ ک. تا ئێستا) دەڵێت: (لم يقع من هؤلاء شرك، وإنما طلبوا الإذن أن يجعل لهم ذات أنواط، أما من وقع في الشرك فإنه يحكم عليه أنه مشرك لأن هذه من الأمور الظاهرة)، واتە: (ئەوانە نەکەوتنە ناو شیرکەوە، بەڵکو تەنها داوای مۆڵەتیان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کە (ذات أنواط)ێکیان بۆ دانێ، بەڵام هەرکەس بکەوێتە ناو شیرکەوە ئەوە حوکم دەدرێ بەسەریدا بەوەی موشریکە لەبەر ئەوەی ئەو کردارە لە بابەتە ئاشکراکانە[١٥٣][١٥٤]).

---

(١٥٢) پەرتووکی: فتوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء - فەتوای ژمارە: ٩٢٦٠ - لاپەڕە: ٣٧٤.
(١٥٣) ڕەحمەتو لێوێ سەرنج بدە وتەکەی صالح فوزان.

ابن تيمية (٦٦١ ك. تا ٧٢٨ ك.) دەڵێت: (فأنكر النبي (ﷺ) مجرد مشابهتهم الكفار في اتخاذ شجرة يعكفون عليها معلقين عليها سلاحهم، فكيف بما هو أطم من ذلك من مشابهتهم المشركين أو الشرك بعينه)[١٥٥]، واتە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) نکۆڵی لە داواکردنی خۆشوبهاندن بە کافرەکان کرد، لەوەی کە دارێک دابنرێت و لەپەنایدا بمێننەوە و چەکەکانی پێدا هەڵبواسرێت، ئەی ئەگەر لەوە بەرز ببوایەتەوە بۆ خۆشوبهاندن بە ئەهلی شیرکەوە یان خودی شیرکەکەیان بکردایە دەبوو چی بوتایە).

کۆتا شت: ئەوان وتیان (ذات أنواط)ێکمان بۆ دانێ تا هۆکارێ بێت بۆ بەهێز بوونی چەکەکانمان، **گریمان** ڕشتە و دەقی هەردوو گێڕەرەوەکە ڕاستە و أبي واقد الليثي یش لە بەدردا موسڵمان بووە، وە ڕستەی (نحن حدثاء عهد بكفر)یش (مدرج) و زیادەیە، هێشتاش شیرکی گەورە نییە، بەڵکو شیرکی بچوکە گەر بیروباوەڕیان وابێ کە هۆکارە بۆ بەهێز بوونی چەکەکانیان، بەڵام گەر خودی دارەکە چەکەکان بەهێز بکات ئەوە شیرکی گەورەیە، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئەو کەسەی ڕاستیی ئەوێت (والله أعلم بالصواب).

---

(١٥٤) پەراوێزی پەرتووکی [عارض الجهل - لاپەڕە: ٣٧١ - دانراوی شێخ أبي العلاء بن راشد].
(١٥٥) إقتضاء صراط المستقيم - لاپەڕە: ٣١٤.

## گومانی شەشەم: (ليس كل من وقع في الكفر وقع الكفر عليه):

موسڵمانانی بەڕێز، کۆتا گومان کە دەیڕەوێنینەوە بە ویستی خوای رب العالمین (ﷻ)، بریتییە لە دوو بنەما، کە ئەمانەن:

١) (ليس كل من وقع في الكفر أو الشرك صار كافرا أو مشركا)، واتە: (مەرج نییە ئەوەی کەوتە ناو کوفر یان شیرکەوە ئیتر کافر یان موشریک ببێت).

٢) (ليس كل من وقع في الكفر وقع الكفر عليه)، واتە: (مەرج نییە ئەوەی کە تووشی کوفر بوو کافربوون بچەسپێت بەسەریدا).

ئێمە لە ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی ئەم دوو بنەمایە، دوو خاڵ باس دەکەین، ئەوانیش:

١) سەرچاوەی ئەم دوو بنەمایە و بەکارهێنانی لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

٢) ناوەکان و حوکمەکان.

**١) سەرچاوەی ئەم دوو بنەمایە و بەکارهێنانی لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت:**

سەرەتا گەر وردبیینەوە و بگەڕێین بە دوای سەرچاوەی ئەم بنەمایە بۆمان دەردەکەوێت لە سەرەتادا موعتەزیلەکان[١٥٦] دواتریش ابن حزم الظاهري الأندلسي (٣٨٤ ک. تا ٤٥٦ ک.) سەرخەری ئەم بیردۆزە بوون، خۆ گەر زانا و پێشەوایەکی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش وا بفەرمووێت، ئەوا قسەی لێ وەردەگیرێت و ڕەتیش دەدرێتەوە، گەر هاتوو لە چوارچێوەی قورئانی پیرۆز و

(١٥٦) موعتەزیلەکان: تاقمێکی کەلامییەکانن، لەسەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچیی سەریانهەڵدا، ناوی (موعتەزیلە) دەگەڕێتەوە بۆ (إعتزال) واتە: (دوورکەوتنەوە)، ئەویش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێشەواکەیان کە واصیلی کوڕی عەطا بوو (٨٠ ک. تا ١٣١ ک.) دوورکەوتەوە لە مەنهەجی دروستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و بە هاوکاری عەمری کوڕی عوبەید (٧٩ یان ٨٠ تا ١٤٣ تا ١٤٤ ک.) بیروباوەڕی پیسی خۆیان و ژەهری خۆیانیان ڕشت و پێیان وترا: (موعتەزیلە یان موعتەزیلەکان). ئەم تاقمە گومڕایە پشتیان بە ئەقڵی کەم ئەقڵی خۆیان دەبەست، لەباتی حساب کردن بۆ دەقە دروستە شەرعییەکان، تاکو هەندێ جار عەقڵیان پێش دەخست بەسەر نەقڵدا کە قورئان و فەرموودەیە، یەکەم کەس بوون کە فەرموودەی ئاحادیان لە بابەتی بیروباوەڕ ڕەتکردەوە، وە بیدعە و داهێنراوێکی سەیریان داهێنا کە ئەویش (منزلة بين منزلتين)ە کە بە کەسێکی موسڵمانیان دەوت گەر تاوانێکی گەورەی ئەنجام بدایە، لای ئەوان ئەو کەسانە نە موسڵمان بوون نە کافر! بەڵکو دەیانوت: (لە دوارۆژدا جێیەکی هەیە لە نێوان ئەو دوو جێیە). باشە ئەو جێیە کوێیە؟ ئێمە نازانین و خۆشیان نازانن، (قبح الله وجههم) ﷻ ڕوویان ڕەش بکات وا ئەم ئاینەیان تێکدا.

فەرموودەی پێغەمبەری دڵسۆز نەبێت (ﷺ). وەک خۆیان فەرموویانە: (گەر قسەمان لە چوارچێوەی قورئان و سوننەت نەبوو ئەوا بیکێشن بە دیواردا). قسەی کەسیش دەق نییە، تاکو بە ناچاریی کاری پێ بکرێ.

بزانە ڕەحمەتو لێوێ، گەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین، دەبینین خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرموێت: ﴿مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ﴾ [157]. واتە: (هەرکەس کوفر بکات ئەوا سزای کوفرەکەی لەسەرە، کە سزاکەشی شادبوونێتی بە دۆزەخ).

وە ئەم بنەمایە بە ڕەهایی وەرناگیرێت، بەڵکو زانایان لە کوفری بچوک کاری پێدەکەن و بەکاری دەهێنن، یاخود ئەوانە کە پۆزشتیان هەیە ئەوانیش وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا بریتین لە:

١) (حديث عهد بالإسلام)، واتە: (کەسێکی تازە موسڵمان بوو).
٢) (نشأ ببادة بعيدة)، واتە: (کەسێک لە شوێنێکی دوور لە بانگەوازیی تەوحید ژیابێت).
٣) (مسائل خفية)، واتە: (لە بابەتە شاراوەکان بێت).

پێویست ناکات وتەی زانایان باس بکەین، لە ماوەی ڕابردوو زۆرمان باسکرد بۆتان بە مننەتی خوای تعالی، لێرەدا بە یەک وتەی إبن باز (١٣٣٠ ک. تا ١٤٢٠ ک.) ئەم خاڵە کۆتایی پێ دێنین، جا لە وەڵامی پرسیارێکدا، کە ئەمە دەقی پرسیارەکەیە: (هل كل يقع في الشرك الأكبر يكون مشركا تطبيق عليه أحكام المشركين؟)، واتە: (ئایا هەر کەسێک کەوتە شیرکی گەورەوە دەبێ بە موشریک، حوکمی موشریکەکانی لەسەر جێبەجێ دەبێ؟). لەوەڵامدا دەڵێت: (**نعم** من كفر بالله صار كافرا ومن أشرك بالله صار مشركا كما أن من آمن بالله ورسوله صار موحدا مؤمنا)[158]، واتە: (بەڵێ هەرکەس کوفر بکات و کافر ببێت

---

(١٥٧) الروم : ٤٤.

(١٥٨)بڕوانە: https://binbaz.org.sa/fatwas/20043/%D9%85%D9%86-%D9%88%D9%82%D8%B9-%D9%81%D9%8A-%D8%A7%D9%84%D9%83%D9%81%D8%B1-%D9%8A%D8%B9%D8%A7%D9%85%D9%84-%D9%85%D8%B9%D8%A7%D9%85%D9%84%D8%A9-%D8%A7%D9%84%D9%83%D9%81%D8%A7%D8%B1.

به الله (ﷻ) ئەوە كافربوون دەچەسپێت بە سەریدا وە هەركەس شیرک بكات و موشریک بێت بە الله (ﷻ) ئەوە موشریک بوون دەچەسپێت بە سەریدا، هەروەک هەركەس ئیمان بهێنێ بە الله (ﷻ) وە پێغەمبەرەكەی (ﷺ) یەک خواپەرست و ئیمانداریی دەچەسپێت بە سەریدا).

**٢) ناوەكان و حوكمەكان:**

مەبەستمان لە ناوەكان بریتییە لە: (موسڵمان ، باوەڕدار ، موشریک ، كافر ، گاور ، جولەكە ، هەڵگەڕاوە ، موونافیق... تاد).

وە مەبەستمان لە حوكمەكان بریتییە لە: (بەری بوون ، دۆستایەتی ، مانەوە لە ئاگر بە هەتا هەتایی ، سزادان و سزانەدان لە ڕۆژی دوایی ، كوشتنی هەڵگەڕاوە... تاد).

لە شەرعی پیرۆزی ئێمەدا خوای رب العالمین جیاوازی خستۆتە نێوان ناوەكانی خەڵكی لە پێش گەشتنی نامەی پێغەمبەرایەتی و لە پاشیشی، وە حوكمی خەڵكی لە پێش و پاش نامە، هەروەک ابن تیمیة (٦٦٦ ک. تا ٧٢٨ ک.) دەڵێت: (إن الله عز وجل فرق بين أسماء وأحكام قبل بلوغ الرسالة وجمع بينهما بعد بلوغ الرسالة)[١٥٩]، واتە: (خوای رب العالمین (ﷻ) جیاوازیی خستۆتە نێوان ناوەكان و حوكمەكان پێش گەشتنی نامە و بانگەوازیی تەوحید، وە كۆكردنەوەی خستۆتە نێوانیان دوای پێگەیشتنی نامە و نامە و بانگەوازیی تەوحید).

وە دەبینین خەڵكانێكی زۆر لە پێش هاتنی پێغەمبەرمان (ﷺ) و پێغەمبەرانی تریش، خەریكی پەرستنی بت و دار و بەرد بوون، بۆ ئەم بابەتە دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز و وتەی زانایانی دڵسۆز:

١) خوای رب العالمین دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ﴾[١٦٠]. واتە: (گەر یەكێک لە موشریكەكان، ئەوانەی كە فەرمانم پێكردوویت بە جەنگكردن لە گەڵیان دوای تەواوبوونی

---

(١٥٩) مجموع فتاوی - بەرگی: ٢٠ - لاپەڕە: ٣٧.
١٦٠ التوبة : ٦.

مانگە حەرامەکان، هاتن بۆ لات و داوای پارێزبەندییان کرد، پارێزبەندییان بەرێ و دالْدەیان بدە، تا گوێبیستی قورئانی پیرۆز و بانگەوازیی تەوحید دەبن، لەبەر ئەوەی ئەوان نەزانن بەرامبەر تەوحید و دینی خوای رب العالمين (ﷻ) پێویست دەکات گوێبیستی وتەی خوای رب العالمين ببن (کە قورئانە)).

**بە پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (گەر سەرنج بدەین دەبینین کەسانێکی **نەزان** پێش پێ گەیشتنی بانگەوازیی رسول الله (ﷺ) بە **موشریک** ناو براون وەک **ناو**، بەڵام وەک حوکم خوای رب العالمين دەفەرموێت: (ئێمە سزای هیچ گەل و کەسێک نادەین تاکو پێغەمبەریان بۆ نەنێرین (عليه السلام))).

٢) خوای رب العالمين دەفەرموێت: (لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنْفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ)[١٦١]. واتە: (ئەوانەی کوفریان کرد لە کافرەکانی ئەهلی کیتاب وە موشریکەکان لە ئەهلی قورەیش دەستبەرداری شیرک و گومراییەکەیان نەبوون، تاکو حوججەیان بۆهات و لەسەریان بەرپابوو کە ئەویش چی بوو؟ قورئانێکی پاک و بێ گەرد بوو)[١٦٢].

**بە پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (گەر سەرنج بدەین دەبینین کە خوای رب العالمين جیاوازی خستوەتە نێوان ناوەکان پێش هاتنی رسول الله (ﷺ)، وە بە (واو)ێکی (عطف) موشریک و کافری فەرموو. وە بنەمایەکی شەرعیمان هەیە دەفەرموێ: (هەموو موشریکێک کافرە، بەڵام مەرج نییە هەموو کافرێک موشریک بێت) بۆ نموونە کەسێک لەگەڵ خوای رب العالمين هاوار بکاتە شتێکی تر، ئەم کەسە موشریکە، موشریکیش ئیمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە و بێ باوەڕ و کافر دەبێت، بەڵام کەسێکی تر هەیە خوای رب العالمين دەپەرستێ بەبێ هاوەڵ و شەریک، بەڵام ئیمان و باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر موحەممەد نییە (ﷺ) ئەم کەسە شیرکی نەکردووە تا موشریک بێت، بەڵام کافرە و کوفری گەورەی هەیە. ابن تيمية دەڵێت: (إسم المشرك يثبت **قبل** بلوغ الرسالة لأنه يشرك ويعدل به).

---

(١٦١) البينة : ١.

(١٦٢) سەیری [تەفسیری (ابن الجوزي بغدادي) و (بغوي) بکە، کە ابن تيمية لە بەرگی: ١٦ لاپەرە: ٤٨٣ و ٤٨٦ هێناویەتی].

٣) خوای تعالی (ﷻ) دەفەرموێت: (اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ)(١٦٣). واتە: (برۆ بۆ لای فیرعەون چونکە ئەو بێ گومان سنوری بەزاندووە و بووە بە طاغوت).

**بە پشتیوانی ﷲ دەڵێین:** (گەر سەرنج بدەین خوای رب العالمین (ﷻ) دەفەرموێت بە موسا: (برۆ بۆ لای فیرعەون، چونکە ئەو سنوری بەزاندووە، و دەڵێت: (من پەروەدگاری گەورەی ئێوەم))، (فادعه إلي توحيد الله وطاعته) وەک ابن جرير طبري دەڵێت، واتە: (برۆ ئەو طاغووتە بانگ بکە بۆ تەوحید و گوێڕایەڵی خوای رب العالمین)(١٦٤). خوای رب العالمین ناوی طاغووت و سنوربەزێنی دا بەسەر فیرعەوندا پێش ئەوەی بانگەوازیی پێ بگات).

٤) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَافِرِينَ)(١٦٥). واتە: (ئەوەی بەربەست بوو لە پێش مەلیکە بەڵقیس بە خوای پەروەردگاری جیهانیان بریتیبوو لەوەی کە ئەو خۆری دەپەرست، ئەمەش ئەوی گێڕایەوە لە پەرستنی خوای رب العالمین و ئەو لەگەڵ قەومێکی کافر بوو تا هاتە لای پێغەمبەر سولەیمان (عليه السلام) کە لە ئایەتی دواتر موسڵمان دەبێت و دەڵێ: (رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)).

**بە پشتیوانی ﷲ دەڵێین:** (گەر سەنج بدەین خوای رب العالمین دەفەرموێت بەڵقیس لە کافران بوو لە کاتێکدا هێشتر دەعوەی پێ نەگەیشتوە! تا دواتر دێت و موسڵمان دەبێت لای پێغەمبەر سولەیمان (عليه السلام)، گەر سەیری تەفسیری ابن کثير بکەین دەبینین کە بە جوانی باسی کردووە کە چۆن بەڵقیس دێت بۆ لای پێغەمبەر سولەیمان (عليه السلام) و موسڵمان بوونەکەی چۆنە).

٥) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ)(١٦٦). واتە: (ئێمەش تۆڵەمان لە فیرعەون و دار و دەستەکەی کردەوە بە نقوم بوون و خنکاندنیان لەدەریای نیل چونکە ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان بەدرۆ دانا لە کاتێکدا غافڵ و بێ ئاگاش بوون لێیان).

(١٦٣) طه : ٢٤.
(١٦٤) جامع البيان - بەرگی: ١٦ - لاپەرە: ٥٢.
(١٦٥) النمل : ٤٣.
(١٦٦) الأعراف : ١٣٦.

**به پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (گەر سەنج بدەین دەبینین خوای تعالی (ﷻ) ئەو شوێنکەوتە و دار و دەستەی فیرعەونیشی (**سزا**)دا لەبەر ئەوەی لەسەرەتادا بە (**ناو**) واتە بە (**إسم**) پێی فەرموون: (**مشرک**) دواتر بۆ (**أحکام**) و سزادانی ئەو موشریکانە دوای (إقامة الحجة) هەر لە دونیادا بە سزای خوای رب العالمین گەیشتن، لە قیامەتیشدا خوای رب العالمین دەفەرموێت: (النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ)).

لە کۆتاییدا **بە پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (ئەم بنەمایە کە دانراوە بۆ کوفر و شیرکێک نابێ کە گەورەیە، بەڵکو گەر بەکاربێت بۆ کوفر و شیرکێک بەکاردێ کە بچوک بێت، ئەمە لە بنەڕەتدا بنەمایە بۆ ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە کوفری بچووک بەرامبەر بە خەواریج).

# دەروازەی شەشەم:



## چەند ئایەتێک و تەفسیریان

ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە بەشێکە لەو گومانانەی ئەوانەی پۆزشت دەدەن بە نەزانین لە شیرکی گەورەی ئاشکرا، دەیهێنینەوە بە بەڵگە، بە پشتیوانی پەروەردگار ڕاڤەیان دەکەین بۆتان، ئەوانیش:

١) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَىٰ إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَعِنْدَ اللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلُ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا)(١٦٧). گەر سەیری هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بکەین، وەک لە پەرتووکەکانی تەفسیردا جێگیر بوون و ئاماژەیان پێدراوە، هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بریتییە لە ڕووداوێک وەک بخاري (١٩٤ ک. تا ٢٥٦ ک.) دەفەرموێت: (کابرایەکی دەوڵەمەند باوەڕی هێنا و موسڵمان بوو، موسڵمانەکانیش بێ ئاگابوون لێی، جا کاتێ هات و سڵاوی لێکردن، ئەوان وتیان: ئەمە بۆ ئەوە سڵاو دەکات تا ئێمە نەیکوژین و مەڕو ماڵاتەکەی بپارێزێ بۆیە لێیان قبوڵ نەکرد و کوشتیان). هەر وەک ابن کثیر (٧٠١ ک. تا ٧٧٤ ک.) لە تەفسیرەکەی هێناویەتی لە أحمد ەوە، کە دەڵێت: (حدثنا يعقوب، قال: حدثنا أبي عن محمد بن إسحاق قال: حدثني يزيد بن عبدالله بن قسيط، عن القعقاع بن عبدالله بن أبي حدرد عن أبيه عبدالله بن أبي حدرد (ﷺ)، قال:) ئەو هاوەڵە بەرێزە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ (إضم) منیش لەگەڵ کۆمەڵێک موسڵمان دەرچووم کە ئەبو قەتادە و حاریسی کوڕی ڕەبیع و موحەللیمی کوڕی جەسامەی کوڕی قەیسی تێدابوو، ڕۆیشتین هەتا چوینە (بطن إضم) عامیری کوڕی الأضبط الأشجعي بە لاماندا تێپەڕی بەسەر وشترێکی نێرینەوە وە هەندێک پێداویستی خۆی پێبوو لەگەڵ دەفرێک شیردا، کە بەلاماندا ڕۆیشت سڵاوی کرد، ئێمەش وازمان لێهێنا، بەڵام موحەللیمی کوڕی جەسامە پەلاماریدا و کوشتی کە لەبەر شتێک کە لە نێوانیاندا

(١٦٧) النساء : ٩٤.

هەبوو، وشتر و ئەو شتەی  پێی بوو بردی بۆ خۆی. کاتێک گەیشتینەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەنگ و باسەکەمان بۆ گێڕایەوە و ئەم ئایەتەی قورئان لەسەرمان هاتە خوارەوە کە خوای تعالی دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ). ئەمە أحمد تەنها خۆی هێناویەتی)).

ئایەتەکەش ئەمە واتاکەیەتی: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ لەبەر خوای تعالی دەچنە جیهاد، یان هەر کارێکی تر دەکەن بە باشی بکۆڵنەوە لەو خەڵکەی پێیان دەگەن و لە خۆتانەوە بە کافریان دامەنێن و مەیان کوژن، وە ئەو کەسەی داوای ئاشتی دەکات، وە دەیەوێ فەرماندار بێت ئیوە پێی مەڵێن: (ئیماندارنیت)، دەتانەوێت بەوە سامان و دارایيەکی ژیانی دونیا بەدەست بێنن؟، لای خوای تعالی (ﷻ) بەخششێکی زۆر و فراوان هەیە، ئێوەش بەر لەمە هەر ئاوابوون و ئیمانتان هەر بەو شێوەیە بوو، لێشتان وەرگیرا، جا خوای رب العالمین (ﷻ) بە بەزەیی خۆی ڕێزی لێگرتن و منەتی نایە سەرتان و دینی خۆی سەرخست، وە ئێوەش ئیمانی خۆتانتان دەربڕی، (فَتَبَيَّنُوا) جا بکۆڵنەوە و پەلەمەکەن لەبڕیاردان و ورد و لەسەر خۆبن، بەڕاستی ﷲ (ﷻ) هەمیشە لەو کار و کردەوەیەی دەیکەن بە ئاگایە)[١٦٨].

**بە پشتیوانی ﷲ دەڵێین:** (ئەم ئایەتە پێمان دەفەرموێ و ئامۆژگاریمان دەکات وردبیینەوە و پەلە نەکەین و لەخۆمانەوە بڕیار نەدەن لەسەر ئیسلام و کوفری کەس، والله أعلم بالصواب).

٢) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَّا تَبِعُوا قِبْلَتَكَ ۚ وَمَا أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ)[١٦٩]. واتە: (گەر بێتو دوای ئەوەی کە زانستمان پێ

---

(١٦٨) تەفسیری پێشەوا ابن كثير و تەفسیری ڕامان.
(١٦٩) البقرة : ١٤٥.

بەخشيت ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەی ئیماندار گەر بێتو شوێن ئەو موشریکانە بکەویت ئەوا ئەوکات تۆ لەڕیزی ستەمکارانیت).

**دەڵێن:** (گەر (مفهم مخالفة)ی ئەم ئایەتە وەبگرین کە ئەمەیە: (گەر بە نەزانینەوە بەگوێی کافران بکەیت یان کارێک بکەیت کە هی موشریک و کافرانە ئەوا هیچت لەسەر نییە)!.

لە وەڵامی ئەم گومانەدا **بە پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (بەو قسەیە بێت، گەر پێغەمبەر (ﷺ) یان ئیمانداران (نعوذ بالله) کوفریش بکەن لە بابەتە ئاشکراکان بە نەزانینەوە هیچیان لەسەر نییە، لە کاتێکدا لە ماوەی ڕابردوو باسمان کرد و لێرەش تەنها ئەوەندا دەڵێین: خوای پەروەردگار (ﷻ) دەفەرموێت: (وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[١٧٠]. واتە: (سوێندبێت بێگومان نیگامان کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش (علیهم الصلاة والسلام) گەر بێتو شیرک بۆ خوای رب العالمین بڕیار بدەن (پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە نێردراوەکانی پاک و بێ شیرک بوون) ئەوا بە بێگومان و بە دڵنیاییەوە هەموو کار و کردەوەکانتان پووچەڵ دەبێتەوە و لە زیانمەندانیش دەبن لە قیامەتدا، والله أعلم بالصواب).

٣) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ)[١٧١]. واتە: (خوای تعالی ئێوەی لەناو پزدانی دایکتان دەرهێنا کە هیچ شتێکتان نەدەزانی و جاهیل بوون وە گوێ و چاوی پێدان هەتا بەژیرانە بیر بکەنەوە بەشکو شوکرانە بژێری بن و بە باشی خوای رب العالمین بناسن).

**دەڵێن:** (ئەم ئایەتە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەصڵ لە مرۆڤدا جەهل و نەزانینە).

---

(١٧٠) الزمر : ٦٥.
(١٧١) النحل : ٧٨.

**به پشتیوانی ﷻ دەڵێین:** ‹بەڵێ وایە لە عەقیدە و بیر و باوەڕی ئەهلی سوننەت جەماعەت ئەصڵ لە مرۆڤدا **جەهل** و نەزانینە، بەڵام خوای رب العالمین فەرمان دەکات پێمان بەوەی عیلم بەدەست بهێنین لە دینەکەمان و بەهەمان شێوەش پێغەمبەری خوا ‹ﷺ› فەرمان دەکات، ئایەت و فەرموودەی دروستی زۆر هەن لەسەر ئەوە، هەر ئەوەندا دەڵێین: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ﴾ کەواتە دەبێ ئێمە ئەو **جەهل** و نەزانینە بگۆڕین بە زانست و زانیاری، والله أعلم بالصواب›.

٤) خوای رب العالمین دەفەرموێت: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ۞ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾[١٧٢]. واتە: ‹وە ئەوانەی کە باوەڕیان نەبووە دەستە دەستە بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن هەر کە نزیک بوونەوە لە دۆزەخ خێرا دەرگایان بۆ دەکرێتەوە و دەرگاوانەکانی دۆزەخ پێیان دەڵێن: ‹ئایا لە خۆتان پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتبوون علیهم الصلاة والسلام کە ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوە؟ وە لە ئاکامی ئەم ڕۆژە ئاگادارتان بکەنەوە؟› ئەوانیش دەڵێن: ‹بەڵێ پێغەمبەران هاتنە لامان، ئەبوو بە گوێمان بکردنایە، بەڵام بەهۆی لاری خۆمانەوە فەرمانی سزای خوای رب العالمین بڕیاردرا بەسەر کافران ۞ پێیان دەوترێ: دەسا لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە بە هەتا هەتایش لەوێبن جا جێگای خەڵکانی لوت بەرز و لەخۆ بایی بوو چەندە خراپە›.

**دەڵێین:** ‹ئەم ئایەتە ئەوە دەسەلمێنێت کە هەموو ئەو کەسانەی کە بە کافری مردوون و چونەتە جهنم ئایەتەکانی خوایان بەسەردا خوێندراونەتەوە و بانگەوازی پێغەمبەرانیان علیهم الصلاة والسلام پێدراوە پاشان بەدرۆیان خستوەتەوە›.

---
(١٧٢) الزمر : ٧١ و ٧٢.

لە وەڵامدا **دەڵێین:** ‹بەڵێ ئەوانەی کە کافرن و لە دۆزەخن ئەوانەن کە ئایەتەکان و بانگەوازیان پێ گەیشتوە، لە دادپەروەری خوای رب العالمین وایە کە سزای کەس نادات تا پێغەمبەری بۆ نەنێرێت، خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[١٧٣]. عەذاب نادات تا ئەو خەڵکە ئاگادار دەبنەوە بەڵام ئەی ئایا کەسانێک کە کوفر و شیرک دەکەن و دەمرن و بانگەوازییان پێ نەگەشتوە؟، چی دەربارەی ئەوان؟ دەڵێین: بە **کۆدەنگی** و **(إجماع)** کافر و موشریکن بە **ناو** بەڵام ڕاجیاوازی و ‹إختلاف› هەیە لە سزادانیان، بەڵکو خوای تعالی تاقیان دەکاتەوە گەر دەرچوون ئەوە بۆ بەهەشت بإذن الله تعالی خۆ گەر دەرنەچوون بۆ دۆزەخ نعوذ بالله، والله أعلم بالصواب›.

٥) خوای رب العالمین دەفەرموێت: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ ۖ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ۞ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾[١٧٤]. واتە: ‹وەختە دۆزەخ لە داخان شەق بەرێت تا دەستەیەک لە خەڵکی تێ فڕێ دەدرێت، دەرگاوانەکانی دۆزەخ پێیان دەڵێن: ‹ئاخۆ ئێوە ترسێنەرتان بۆ نەهات؟› ۞ لەوەڵامدا دەڵێن: ‹بەڵێ ترسێنەر هاتبووە لامان ئەوسا باوەڕمان پێنەکرد و وتمان خودا هیچ شتێکی نەناردووەتە خوارەوە ئێوە بێ گومان لەناو گومڕاییەکی گەورەدان››[١٧٥].

**دەڵێن:** ‹ئەم ئایەتەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو کافرانەی لە دۆزەخن ئایەتەکانی خوا هەروەها نێردراوەکانیشیان بەدرۆ خستوەتەوە عیاذا بالله›.

لە وەڵامدا **بە پشتیوانی ﷻ ئەڵێین:** ‹بێگومان ئەو کەسانەی پێغەمبەران و ئایەتەکانی خوای رب العالمین بە درۆ دەخەنەوە ئائەوانە کافرن کافرێکی (معذب)، واتە لە ڕۆژی قیامەت سزا دەدرێن هیچ بەڵگەیەکی تێدا نابینم بۆ پێدانی پۆزشت بە نەزانین!، والله أعلم بالصواب›.

---

(١٧٣) الأسراء : ١٥.

(١٧٤) الملک : ٨ و ٩.

(١٧٥) تەفسیری إبن کثیر - لاپەڕە: ١٨٩٩ - چاپخانەی: إبن حزم.

٦) خوای رب العالمين دەفەرموێت: (رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا)[١٧٦]. واتە: (پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام مژدەدەر و ترسێنەر بوون، مژدە دەدەن بەو کەسانەی کە گوێڕایەڵی ﷲ دەبن و شوێن ڕەزامەندی ئەو دەکەون لە چاکەخوازیدا، ئەو کەسانەش دەترسێنن کە دژی فەرمانەکانی دەبن و بڕوا بە پێغەمبەرەکانی ناهێنن بە سزا و تۆڵەی سەخت تا لەپاش پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام ئەو خەڵکە هیچ بەڵگەیەکیان لەلا نەبێت بۆ لای خوای رب العالمین. خودا خاوەن دەسەڵاتی کارزانە. واتە: خودای پەروەردگار کتێبەکانی ناردووە و پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە بە مژدەدەر و ترسێنەر ڕونیشی کردووەتەوە کە چی پێ خۆشە و لێی ڕازیە وە چیشی پێ ناخۆشە و لێی ناڕازیە، بۆ ئەوەی هیچ کەس بیانوی نەمێنێ)[١٧٧].

**دەڵێن:** (ئەم ئایەتە ئەوە دەسەلمێنێت کە بەڵگە لەسەردانان بە هاتنی پێغەمبەر بۆ ڕونکردنەوەیە بۆ کەسە).

لە وەلامدا **بە پشتیوانی** ﷲ **دەڵێین:** (گەر مەبەستت پێ ئەوەبێ کە نیسبەت دانە پاڵی کەسێک بە ئیسلام یان کوفر وەک **ناو** نابێت تاکو پێغەمبەر (ﷺ) نەیەت، واتە: (بە ناو بە کەسێک ناڵێین موشریک هەتا پێغەمبەر نەیەت و بۆیان ڕوون نەکاتەوە)، دەڵێین: (خَطَئتُم) هەڵەتان کرد، بەڵکو وەک **ناو** بەو کەسانە دەوترێ موشریک کە شیرکیان کرد بەڵام **عەذاب** و **سزا** بەوەی:

١) چ لە قیامەت بەوەی کە جاهیلن و هیچیان نەبیستووە سزا نادرێن.

٢) وە چ لە دونیادا دادوەر و قاضي موسڵمانان سزایان نادات تا (إقامةُ الحُجَّة)یان نەکات، مادام ئەوان (**بالفعل**) نەزانن.

---

(١٧٦) النساء : ١٦٥.

(١٧٧) تفسیر إبن کثیر - لاپەڕە: ٥٦٣.

بەڵام بە موشریک و کافر ناو دەبرێن، بەڵگەش زۆرە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ)، یەک لەوان: (وَصَدَّهَا مَا كَانَتْ تَعْبُدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِنْ قَوْمٍ كَافِرِينَ)[178]. خوای تعالی بە بەلقیس دەفەرموێت: (کافر) لە کاتێکدا دەعوەی پێ نەگەشتوە، والله أعلم بالصواب).

٧) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا)[179]. واتە: (هەر کەسێک پاش ئەوەی ڕێگەی ڕاستی بۆ ڕۆشن بوویەوە، دژایەتی پێغەمبەر بکات (ﷺ) وە ڕێگا و ڕێبازێکی تر بگرێتە بەر کە ڕێگای ڕاستی باوەڕداران نەبێت ئێمەش ڕووی ئەکەینە ئەو ڕێگا و ڕێبازە و وازی لێ دەهێنین لەسەر ئەوەی کە بۆ خۆی هەڵیبژاردووە ریسوای دەکەین و سەرکەوتووی ناکەین بۆ خێر و چاکە، تا دەیبەینە دۆزەخ و دوا ڕۆژی خراپ دەبێت)[180].

٨) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُمْ مَا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ)[181]. واتە: (پاش ئەوەی خوای تعالی کۆمەڵێکی خستەسەر ڕێ هەتا دیاری نەکات بۆیان لەچی خۆ بپارێزن لەڕێ گومڕایان ناکات)

موجاهید (٢١ ک. تا ١٠٤ ک.) لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت: (ئەم ئایەتە ڕوونکردنەوەیەکی خوایە هاتووە بۆ خاوەن باوەڕان کە وازبهێنن لە پاڕانەوە بۆ ئەوانەی کە موشریک بوون، وە لە ڕوونکردنەوەکەشیدا بێ گوێی و گوێڕایەڵی بۆ گشتی ڕۆشن کردووەتەوە و فەرمویەتی ئەوە بکەن یان واز لەوە بهێنن).

(١٧٨) النمل : ٤٣.
(١٧٩) النساء : ١١٥.
(١٨٠) تەفسیری ڕامان و إبن كثير و عبدالرحمن ناصر السعدي.
(١٨١) التوبة : ١١٥.

ابن جريری طبري (٢٢٤ ک. تا ٣١٠ ک.) له تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (خوای رب العالمین سزای نەداون لەسەر پاڕانەوەتان بۆ ئەوانەی شیرکیان بۆ خوای رب العالمین بڕیار داوە و مردوون و بڕیار نادات بەسەرتاندا کە تاونبارن دوای ئەوەی کە ئەو خوایە ڕێگەی نیشانداون و یارمەتیدان بۆ باوەڕ هێنان بە خۆیی و پێغەمبەرەکانی علیهم الصلاة والسلام ئەگەر لە پێشەوە ڕێگری لێ نەکردبن لێی کە وازی لێ بهێنن یان پێش ئەوەی خراپیی ئەو شتەتان بۆ ڕوونبکاتەوە کە مەیکەن، ئێوە بەر پرسیار نەبوون لەوەی قەدەغەی کردووە لێتان، چونکە خودا ئەوە بە گومڕایی لە قەڵەم نادات پێش ئەوەی فەرمان یان قەدەغەکردنەکە دابەزێنێت).

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بریتیبوو لەوەی کە کۆمەڵێک موسڵمان داوای لێخۆشبوونیان کردبوو بۆ موشریکەکان[١٨٢].

٩) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ)[١٨٣]. واتە: (ئەوانەی پاشگەز بوونەوە و هەڵگەڕانەوە لە دین بۆ خوانەناسی لە دوای ئەوەی کە شارەزابوون شەیتان ئەوەی بۆ جوان کردن و ڕازانیەوە. خەڵەتاندنی و بای هەوای کرد)[١٨٤].

١٠) خوای رب العالمین دەفەرموێت: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)[١٨٥]. واتە: (هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیللا بە زمانی گەلەکەی خۆی ناردوومانە تا هەقیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە وە خوای رب العالمین کێی بوێ گومڕای دەکات وە کێی بوێ هیدایەتی دەدات. هەڵبەت ئەوەی شایستەی گومڕابوون بێت

(١٨٢) تەفسیری طبري ، وە تەفسیری ابن کثیر.
(١٨٣) محمد : ٢٥.
(١٨٤) تەفسیری إبن کثیر.
(١٨٥) إبراهيم : ٤.

گومڕای دەکات وە بەپێچەوانەشەوە، هەر خۆی خاوەن دەسەڵات و کارزانە لە کارەکانیدا)[١٨٦].

**دەڵێن**: لەسەر ئەم چوار ئەم ئایەتەی کە باسکران: (ئەم چوار ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕوونکردنەوە و پێگەیاندنی بەڵگەکان مەرجە بۆ حوکمدان بە هەڵگەڕانەوە لەدین بۆ ئەو کەسەی داخڵی ئیسلامی حوکمی بووە بە هێنانی شایەتمان کەواتە دەبێت عیلمی پێی هەبێ و جەهلی نەبێت بابەتەکەی لا ڕوون بێت وەک خوای تعالی فەرموی لە ئایەتەکەی سەرەوەیان: (مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى)).

لە وەڵامی ئەم شوبهەیەدا **بە پشتیوانی** ﷻ **دەڵێین**: (یەکێک لە مەرجەکانی کافرکردنی دیاریکراو (شروط التكفير المعين) بریتییە لە زانست (علم)، کەسێ کە شایەتمانی هێناوە و داخڵی ئیسلام بووە، گەر کوفرێکی کرد لە دین هەڵدەگەڕێتەوە و بنەچینەکەی تێکداوە، گەر تازە موسڵمانبوو بوو وە زانستی بە شتەکە نەبووا، واتە بەرامبەری ئەمە نەزانین و جەهلی پێی هەبوو ئەوە پۆزشت و عوزری بۆ هەیە، بەڵام تازە موسڵمانبوو **نەبوو** وە کوفری کرد، کوفرەکەی **کوفری گەورەی ئاشکرابوو** نەزانین ڕێگر نییە لە کافربوونی، سەبارەت بە بەشی کۆتایی ئەو شوبهەیە کە دەڵێت: (دەبێ عیلمی پێی هەبێ و جەهلی پێی نەبێت مەسەلەکەی لا ڕوون بێت))، دەڵێین: (حوکمدان بە کافربوونی کەسێک لە کەس و شوێنێکەوە بۆ کەس و شوێنێکی دیکە دەگۆڕێت، کەسێک کە لەناو موسڵمانان بژی و تازە موسڵمانبوو نەبێت، بڵێ نەمزانیوە کە نوێژ یان زەکات یان ڕۆژوو یان حەج یان جگە لەوانە لەو شتانەی کە (معلوم من الدين بالضرورة)یە، بڵێ زانست و زانیاریم نییە بە واجبێتی ئەمانە و نەمزانیوە کە واجبن، ئەم کەسە ئەم جەهلەی وەرگیراو نییە و ڕێگر نییە لە کافرکردنی، بەڵام کەسێک کە تازە موسڵمان بووە یان لە شوێنێکە کە موسڵمانی لێ نییە بۆی ڕوون بێتەوە دینی ئیسلام، ئەمە گەر کوفرێکی کرد ئەو کات پۆزشتی بۆ هەیە.

---

(١٨٦) تەفسیری إبن كثير.

بەڵگەکان زۆرن باسیان ناکەین تەنها ئەوە باس دەکەین کە ئەوانەی کە لە جیهاد بوون لە غەزای تەبووک کە تازە موسڵمانبوو نەبوون ئەو قسەیان کرد خوای رب العالمین ئەو پۆزشتەیانی قبوڵ نەفەرموو، والله أعلم بالصواب).

١١) کۆتا ئایەت خوای رب العالمین دەفەرموێت: (مَنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[١٨٧]. واتە: (ئەوەی ڕێگای حەق و ڕاستیی بگرێ، ئەوە بۆ خۆی شارەزا و هیدایەتدراو بووە، هەرکەسیش ڕێگەی ون بکات و لاڕێ بێت، ئەوەش تەنها لەسەر خۆی دەکەوێت کەسیش تاوان و گوناهی کەسی تر هەڵناگرێت، وە ئێمە **سزای** هیچ کەسێک نادەین تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین).

**بە پشتیوانی** ﷻ **دەڵێین:** (گەر مەبەستتان ئەوەبێ کە کەسێک نەزان بێت و بانگەوازیی دینی پێ نەگەشتبێ، کوفر یان شیرک بکات خوای تعالی مادام پێغەمبەری بۆ نەناردووە و بەڵگەی لەسەر بەرپا نەبووە، کافر نییە و تەکفیری ناکەین!. ئەوە دەڵێین: هەڵەیە، زۆرمان وت بە فەضلی خوای رب العالمین لەسەر ئەم بابەتە لە پێشوو، ئەم ئایەتە موبارەکە دەفەرموێت: ئێمە **سزا** نادەین، نافەرموێ: (تەکفیر ناکەین) یان نافەرموێ: (پۆزشتیان بۆ هەیە بەوەی پێیان ناوترێ موشریک)، والله أعلم بالصواب).

---

(١٨٧) الإسراء : ١٥.

# دەروازەی حەوتەم:



## شەش خاڵی بەتاڵ و پووچ

شەش خاڵی بەتاڵ و پووچ پێویست دەکات بوترێت گەر نەزانین لە شیرکی گەورەدا پۆزشت بێت:

١) پێویست دەبێ پۆزشت بهێنرێتەوە بۆ جولەکە و گاورە نەزانەکان، کە زانست و زانیارییان پێ نییە و کوفر و بێ دینی دەکەن، ئەوەش پێچەوانەی ئیمانە.
٢) پێویست دەبێ پۆزشت بهێنرێتەوە بۆ ئەهلی فەترە بەهۆی نەزانینەوە کە کوفر و شیرکیان کردووە، کە ئەمەش پێچەوانەی کۆدەنگی و (إجماع)ە.
٣) پێویست دەبێ پۆزشت بهێنرێتەوە بۆ دووڕووە نەزانەکان، ئەوەش پێچەوانەی کۆدەنگی پێشینی چاکە (سلف الصالح).
٤) پێویست دەبێ پۆزشت بهێنرێتەوە بۆ هەرکەسێک کە نکۆڵی ڕبووبیەت دەکات بە نەزانینەوە، کە ئەمەش پێچەوانەی کۆدەنگی پێشینی چاکە.
٥) پێویست دەبێ پۆزشت بهێنرێتەوە بۆ هەرکەسێک کە نکۆڵی لە زانستی خوای رب العالمین دەکات بەهۆی نەزانین یان لێکدانەوە و (تأویل) کە ئەوەش پێچەوانەی کۆدەنگی پێشینی چاکە.
٦) پێویست دەبێ پۆزشت بهێنرێتەوە بۆ هەرکەسێک کە سیفەتی خوای رب العالمین پەک دەخات بەهۆی نەزانینەوە لە جەهمییەکان کە ئەمەش پێچەوانەی کۆدەنگی پێشینی چاکە.

تێبینی:

١) گەر کەسێک لە شوێنێک بوو کە ئیسلام و موسڵمانانی لێ نەبوو، بۆ نموونە ئەمازۆن لە ئەمریکای باشور، وەک دەڵێن کەسانێکی لێیە هیچ دینێکیان نییە و زۆر دواکەوتون لە هەموو ڕوویەکەوە. ئەم کەسە موشریکە، ئایا موسڵمانە؟ خۆ هیچیشی پێ نەگەشتووە!، بۆیە لە پێش ئەوەی (إقامة الحجة)ش بکرێت **ناوی** موشریکی بەسەردا دەچەسپێت، والله تعالى أعلم.

٢) گەر کەسێک لە شوێنێک بوو کە ئیسلام و موسڵمانانی لێبوو، ئەم کەسە گەر نەزانیش بێت پۆزشتی قبوڵ نییە، چونکە (تقصیر)ی کردووە و کەم تەرخەم بووە، وە نەگەڕاوە بە شوێن زانستدا، والله تعالى أعلم.

٣) **ناو** لە پێش گەیشتنی بەڵگە بە کەسەکە دادەبڕێت بەسەریدا گەر کوفر یان شیرکی گەورەی ئەنجامدا، بەڵام **سزا** جێبەجێ نابێت جا یەکسانە:

١) حوکمی دونیایی، بەوەی دادوەری موسڵمانان تا (إقامة الحجة)ی نەکات حەددی لەسەر جێبەجێ ناکات، وە سێ ڕۆژی بۆ دادەنێت گەر گەڕایەوە الحمدلله، خۆ گەر نەگەڕایەوە ئەوکات حەددی مورتەدی لەسەر جێبەجێ دەکات.

٢) ڕۆژی قیامەتیش، بەوەی خوای تعالى ئەم کەسە تاقی دەکاتەوە گەر بێتو ئەم کەسە نەزان بێت، گەر سەرکەوتوو بوو الحمدلله بۆ بەهەشت، گەر نا بۆ دۆزەخ پەنا دەگرین بە الله (ﷻ)، والله تعالى أعلم.

## له كۆتایدا:

ئەوەی ڕاست و دروست بوو له اللَّهُ (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) وه بوو، وه ئەو پێی بەخشیوین، ئەوەی هەڵه و پەڵه بوو له شەیطانی ئیبلیسی نەگریس و منی تاوانبار بوو، ئێوەی بەڕێز و سەنگینیش له نزای خێر بێ بەشمان مەكەن.

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وآله وصحبه أجمعين

ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين

الفقير إلــى اللهِ الـعـزيـزِ الـعـليّ

إبن عبدِاللهِ السيتلاني الشّهرزوريّ

الأربعاء: ٢٠ / ذو القعدة / ١٤٤٢ : هجرية

حلبجة جديدة - شهرزور[١٨٨]

(١٨٨) ئەو بەرواره بەرواری نوسینی نامیلكەكەیه، به پشتیوانی اللَّهُ (جَلَّ جَلَالُهُ) له تەواوبوونی نامیلكەكه بوومەوه لەبەرواری:

٢ / ذي الحجة / ١٤٤٣ی كۆچیی

ڕۆژی هەینی

## کورتەی بابەتەکە بە هێڵکاریەک:



## سەرچاوەكان:

### ١) عەرەبییەكان:


١) قورئانی پیرۆز.

٢) أقوال الشيخ عبدالعزيز بن باز في العذر بالجهل ويليه مقال في الدضر بالجهل للشيخ صالح بن فوزان الفوزان ، جمع وترتيب: علي بن سعود بن علي العرجاني العجمي ، تقديم: صالح بن فوزان الفوزان ، مدار الوطن للنشر - ١٤٣٨.

٣) تحفة الإخوان بأجوبة مهمة تتعلق بأركان الإسلام ، لشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز ، مؤسسة الشيخ عبدالعزيز بن باز الخيرية.

٤) تفسير القرآن العظيم ، للحافظ الإمام إبن كثير الديمشقي ، دار ابن حزم.

٥) تفسير القرآن العظيم ، لإمام الحافظ ابن ابي حاتم ، مكتبة نزار مصطفى الباز.

٦) تيسير الكريم الرحمن في تفسير المنان ، للعلامة الشيخ عبدالرحمن ناصر السعدي ، دار السلام.

٧) الجامع لأحكام القرآن (تفسير القرطبي) ، لإمام المفسر القرطبي ، مؤسسة الرسالة.

٨) جامع البيان (تفسير الطبري) ، لإمام المفسر ابن جرير الطبري ، دار هجر.

٩) حكم تكفير المعين والفرق بين قيام الحجة وفهم الحجة ، العلامة الشيخ إسحاق بن عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ ، دار طيبة.

١٠) خطبة الحاجة التي كان رسول الله (ﷺ) يعلمها أصحابه ، الألباني ، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، ١٤٢١.

١١) الدرر السنية في الأجوبة النجدية ، لشيخ عبدالرحمن بن محمد بن قاسم العاصيمي النجدي الحنبلي.

١٢) سنن ابن ماجه ، لإمام ابن ماجه ، مكتبة المعارف.

١٣) سنن الترمذي ، لإمام أبو عيسى الترمذي ، دار إبن كثير.

١٤) صحيح بخاري ، لإمام محمد بن إسماعيل البخاري ، دار إبن كثير.

١٥) صحيح مسلم ، لإمام مسلم بن حجاج النيسابوري ، دار طيبة.

١٦) صحيح مسلم بشرح النووي ، النووي ، المطبعة المصرية بالأزهر.

١٧) عارض الجهل وأثره على أحكام الإعتقاد عند أهل السنة والجماعة ، لشيخ أبي العلا بن راشد بن أبي العلا الراشد ، راجعه وقدم له وقرظه الشيخ: صالح بن فوزان الفوزان ، مكتبة الرشد.
١٨) العذر بالجهل تحت المجهر الشرعي ، لشيخ أبي يوسف مدحت بن الحسن آل فراج ، قدم له الشيخ: عبدالله بن عبدالرحمن الجبرين ، دار الكتاب و السنة.
١٩) فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء ، لشيخ أحمد الدويش ، المجموعة الأولى ، مؤسسة الأميرة العنود بنت عبدالعزيز آل سعود الخيرية.
٢٠) كتاب التوحيد ، لإمام الحافظ ابن منده ، مطابع الجامعة الإسلامية بالمدينة المنورة.
٢١) مجموع فتاوى ، ابن تيمية.
٢٢) مجموع فتاوى ومقالات متنوعة ، عبدالعزيز بن عبدالله بن عبدالرحمن بن باز ، دار القاسم.

٢) **کوردییەکان:**
١) پرسی عوزر بە جەهل و تەئویل و تەقلید بۆ ئەهلی کوفر و شیرک و ئیلحاد لە نێوان ڕۆشنایی قورئان و مەنهەجی سەلەف و بیرو بۆچوونی مورجیئەکان و ئەهلی عیناد ، ئامادەکردنی: مەبەست کاژاوی.
٢) تەفسیری ڕامان لە مانا و مەبەستەکانی قورئان ، شێخ أحمد کاکە مەحموود - چاپی شەشەم ، ١٤٤١.
٣) حكم تكفير المعين والفرق بين قيام الحجة وفهم الحجة ، وەرگێڕان و تەعلیقاتی: عبدالرحمن شارەزووری.
٤) العذر بالجهل کۆکەرەوە لە وتەی زانایانی دەعوە لە باسی جەهل لە شیرکی گەورەدا ، کۆکردنەوە و تعلیق: الشيخ علي بن خضير الخضير (فک الله أسره) ، وەرگێڕانی: هاوکار کوردی - ١٤٤٠.
٥) فەرهەنگی دەریا عەرەبی - کوردی ، ڕزگار کەریم ، چاپی دووەم ، ٢٠١٠ ، چاپخانەت مەهارەت.

٦) فەرهەنگی شیرینی کوردی عەرەبی - کوردی ، فازیل نیزامەدین ، چاپی سێیەم ، ٢٠١٥ ، کتێبخانەی زانیار ، سلێمانی.
٧) فەرهەنگی نۆبەرە عارەبی - کوردی ، گیو موکریانی ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٥ ، هەولێر.
٨) کۆمەڵێک وانەی مامۆستایانی ئاینی ئەهلی تەوحید، جزاهم الله خیرا.
وە سوودم وەرگرتووە لە کۆمەڵێک سایت و ماڵپەڕی گوگڵ بۆ گواستنەوەی ئایەتەکان و فەرموودەکان و وتەی زانایان.

فهرس


| بابەتەكان | ژ. لاپەڕەكان |
|---|---|
| **زانیاری زمانەوانی** | ٤ |
| **پێشەكی** | ١٢ |
| **پێشەكی نووسەر** | ١٥ |
| **ڕێخۆشكار** (رحمه الله) | ١٨ |
| **دەروازەی یەكەم: ١٠ وتە وەک پێشەكی** | ٢٢ |
| **دەروازەی دووەم: چوار بنەما بۆ جۆرەكانی پۆزشت لە شیرک و كوفردا:** | ٢٨ |
| یەكەم: (الأصل في الشرك عدم قبول الإنذار). | ٢٨ |
| دووەم: (لا عذر للمشرك بالجهل، بل الجهل بالتوحيد شرك أكبر). | ٣٠ |
| سێیەم: (لا عذر للمشرك بالتأويل). | ٣٣ |
| چوارەم: (لا عذر للمشرك بالتقليد). | ٣٥ |
| **دەروازەی سێیەم: بۆچونی چوار ڕێبازەكە لەسەر پرسی پۆزشت بە نەزانین:** | ٣٧ |
| **١/ حەنەفییەكان:**<br>١) ملا علي القارئ الحنفي (و. ١٠١٤ ک.).<br>٢) خاوەنی پەرتووكی [درر البحار]. | ٣٧<br>٣٧<br>٣٧ |
| **٢/ مالیكییەكان:**<br>١) القرافي المالكي (٦٢٦ ک. تا ٦٨٤ ک.).<br>٢) قاضي العياض (٤٧٦ ک. تا ٥٤٤ ک.).<br>٣) محمد بن عرفة المالكي (و. ١٢٣٠ ک.). | ٣٨<br>٣٨<br>٣٨<br>٣٨ |
| **٣/ شافعییەكان:**<br>١) الشافعي (١٥٠ ک. تا ٢٠٤ ک.). | ٣٩<br>٣٩ |
| **٤/ حەنبەلییەكان:**<br>١) ابن القيم الجوزي الحنبلي (٦٩١ ک. تا ٧٥١ ک.). | ٤٠<br>٤٠ |
| **دەروازەی چوارەم: باقی وتەی زانایان:** | ٤١ |
| ابن تيميه (٦٦١ ک. تا ٧٢٨ ک.). | ٤١ |
| عبدالله أبا بطين (و. ١٢٨٢ ک.). | ٤١ |
| عبدالله أبا بطين (و. ١٢٨٢ ک.). | ٤١ |

| | |
|---|---|
| أبا بطين (و. ١٢٨٢ ک.). | ٤٢ |
| أبا بطين (و. ١٢٨٢ ک.). | ٤٣ |
| إسحاق آل الشيخ (١٢٧٦ ک. تا ١٣١٩ ک.). | ٤٣ |
| سليمان بن سحمان (١٢٦٦ ک. تا ١٣٤٩ ک.). | ٤٤ |
| عبدالعزيز بن عبدالله بن باز (١٣٣٠ ک. تا ١٤٢٠ ک.). | ٤٥ |
| فەتواکانی لیژنەی هەمیشەیی فەتوا:<br>یەکەم: فەتوای ژمارە: ٤٤٠٠.<br>دووەم: فەتوای ژمارە: ٤١٤٤.<br>سێیەم: فەتوای ژمارە: ٦٣١٠. | ٤٥<br>٤٥<br>٤٧<br>٤٩ |
| عبدالعزيز بن باز (١٣٣٠ ک. تا ١٤٢٠ ک.). | ٥٠ |
| **دەروازەی پێنجەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان:** | ٥٤ |
| یەکەم: (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا). | ٥٤ |
| دووەم: فەرموودەی (پیاوەکەی نەوەی ئیسرائیل). | ٥٦ |
| سێیەم: فەرموودەی (ڕووداوی حەوارییەکان). | ٦٧ |
| چوارەم: کڕنووش بردنەکەی معاذ بن جبل (رضي الله عنه). | ٧٢ |
| پێنجەم: فەرموودەی (ذات أنواط). | ٧٦ |
| شەشەم: (ليس كل من وقع في الكفر وقع الكفر عليه). | ٨٣ |
| **دەروازەی شەشەم: چەند ئایەتێک و تەفسیریان:** | ٨٩ |
| یەکەم: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَىٰ إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَعِنْدَ اللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلُ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا). | ٨٩ |
| دووەم: (وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَا تَبِعُوا قِبْلَتَكَ ۚ وَمَا أَنْتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُمْ بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَمِنَ الظَّالِمِينَ). | ٩٠ |
| سێیەم: (وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ). | ٩١ |
| چوارەم: (وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ | ٩٢ |

| | |
|---|---|
| يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ۞ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ). | |
| پێنجەم: (تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ ۖ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ۞ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ). | ٩٣ |
| شەشەم: (رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا). | ٩٤ |
| حەوتەم: (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا). | ٩٥ |
| هەشتەم: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُمْ مَا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ). | ٩٥ |
| نۆیەم: (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ). | ٩٦ |
| دەیەم: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ). | ٩٦ |
| یازدەیەم: (مَنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا). | ٩٨ |
| دەروازەی حەوتەم: شەش خاڵی بەتاڵ و پووچ | ٩٩ |
| تێبینی | ١٠٠ |
| لە کۆتاییدا | ١٠١ |
| کورتەی بابەتەکە بە هێڵکارییەک | ١٠٢ |
| سەرچاوەکانی ئەم نامیلکەیە | ١٠٣ |
| فهرس | ١٠٦ |

## نوسراوەکانمان:

١) الوجيز في العذر بالجهل – پوختەیەک دەربارەی پۆزشت بە نەزانین، **ئەمەی بەردەستتە.**

٢) تەکفیر و جۆرەکانی مەرجەکان و ڕێگرییەکان و بنەماکانی – التكفير وأنواعه شروط وموانع وقواعده، **بڵاونەکراوەتەوە، لەوایە بڵاوبکرێتەوە.**

٣) بگە بە مەرام لە زانینی شوێنی دەست گرتن لە دوای تەکبیرەی ئیحرام، **بڵاونەکراوەتەوە، لەوایە بڵاوبکرێتەوە.**

٤) حوکمی دیموکراسی و هەڵبژاردن و دەنگدان لە شەریعەتەکەی اللەی ڕەحمان، **بڵاونەکراوەتەوە.**

٥) الشرح والبيان في متن الرسالة إلى الإخوان – ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی مەتنی نامەیەک بۆ برایان، **بڵاونەکراوەتەوە.**

٦) ڕوونکردنەوە و لێدوان لەسەر بەهێزترین وتاری مامۆستا کامەران، **بڵاونەکراوەتەوە.**

٧) وەڵامێک بۆ هەندێ نەزان بە ئیقامەی حوججە و لادانی گومان لەسەر یەک دوو وتەی م. کامەران، **بڵاونەکراوەتەوە.**

نزای خێرمان بۆ بکەن